ئامادەکردنی:

سەیید نەجمەدین ئەنیسی



# دیوانی حەریق



مەلا ساڵحی کوڕی مەلا نەسروڵڵای زێوییی

وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی




بەڕێوەبەرێتیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی
سلێمانی

# دیوانی حەریق


- ئامادەکردن: سەیید نەجمەدین ئەنیسی
- بابەت: دیوانی شیعری
- پیتچنی: رووپاک مەحمود
- هەڵەچنی: سۆران عوسمان
- نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- نەخشەسازیی ناوەوە: رووپاک مەحمود
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلا
- قەبارەی کتیب: **٢٣×٢٣**
- زنجیرەی گشتیی کتیب: (**٨٨٥**)
- تیراژ : (١٠٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی بینایی
- نرخ: (٤٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (**١٩٦٤**)ی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشـنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**

**گردی ئەندازیاران.**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩**

## سوپاس و پێزانین...

پێغەمبەری مەزنی ئیسلام حەزرەتی محمد رەسولی ئەکرەم (د.خ) فەرموویەتی:
کەسێك بە چاکەی خەڵك نەزانێ بە چاکەی خودایش نازانێ، جا لەبەر ئەمە پڕ بەدڵ لـە دۆستی بەڕێز و زانا فەرهەنگ، خۆشەویست و دڵسۆزم جەنابی مامۆستا محەمـەد سـاڵح ئیبراهیمی محەمەدی (شەپۆل) زۆر سپاس دەکـەم کـە بـە دیـوانی حـەریق دا چـۆتەوە و هەڵەی گرتووە و نیشانەکانی بۆ داناوە.

***

# بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی ئەو خودایەی کە بێوێنە و هاوتایە و بەدیهێنەری زەمین و سەمایە و هەتا دونیا دونیایە هەر ئەو شایانی سوپاس و ستایش و سەنایە، سڵاو لەو پەیامبەرەی کە خۆشەویستی خودایە، پەیام هێنەری نور و ڕووناکی و سەفایە، لەپاش ئەو پەیامبەرێك نابێت و نایە، دروود لەسەر ئال و یارانی هەتا هەتایە.

*** 

لەپاش پێشکەشکردنی ئەو سوپاس و ستایش و سڵاوە بە ڕێگای دڵدا دەڕۆین و دڵ بە شاعیری دڵسووتاو بە ئاگری سۆفیەتی مامۆستا مەلا ساڵحی "حەریق" دەسپێرین و باسی شیعر و بەسەرهاتی ژیانی دەکەین. وە ئەو بەڵگە و نووسراوانەی کە لە شوێنەواری شاعیران و نووسەران و لێکۆڵەرانەوە بۆمان بەجێماون دەیانکەین بە ڕێنوێنی ڕێگامان بۆ ئەوەی "حەریق" چاتر و باشتر بناسین، ئەو حەریقەی کە بە مامۆستای مەدرەسەی شیعر و ئەدیبی فێرگەی ئەوین و ئاگر هەڵگیرسێن ناوبانگی دەرکردووە و شیعری ئاگرینی هۆنیوەتەوە.

# حەریق

## ١٨٥١- ١٩٠٧

گەوهەرناسی کەم وێنەی دەریای عیرفان و تەحقیق
شاعیری ڕێبواری ڕێگەی تەسەووفی پیری شەفیق
سەوداسەری مەعنەویاتی یوسفی میسری تەریق
بە ئاگری عیشق سووتاوە بۆیە نازناوی کردووە بە"حەریق"

گەوهەری تروسکەدار و بەنرخی ناو سەدەفی ئەم دەریایەمان ناوی مەلا سالّح و کوڕی مەلا نەسروڵڵای زێوێییە، زێوێ دێیەکە لە سورداش لە ناوچەی سولەیمانی پالّی داوە، بەلای ڕۆژهەلاّتی کێوی پیرەمەگرونەوە، مەلا نەسروڵڵای باوکی خەلّکی دێی کاشتەرە، کاشتەر و لۆن دوو دێن پالّیانداوە بە کێوی شاهۆوە کە کەوتۆتە بەینی هەورامانی لهۆن و جوانڕووە، دیوی جنوبی پالّیداوە بە مایدەشتەوە، مەلا نەسروڵڵا بە فەقێیەتی ولاّتەکەی خۆی بەجێهێشتووە و لە پاشا بە مەلایەتی لە دێی "زێویە" دەگیرسێتەوە و ژن دێنێ، مامۆستا "حەریق) لە سالّی ١٨٥١ زایینی لە دێی "زێوێە" ئەستێرەی ژیانی تریفەیداوە و چاوی بە ڕووناکایی دنیا هەلّێناوە، خوێندنی سەرەتایی لەلای باوکی دەستپێدەکات و لە پاشا دەچێتە سولەیمانی و لە مزگەوتی شێخ محەمەدی بەرزنجی دەبێ بە سوختەی فەقێیان و گەشتێکی قەرەداغیشی بووە، لە بیارەش باسی "نیکاح" لە کتێبی "منهاج"ی ئەوەوی لەلای شێخ حەیدەر دەخوێنێ و سەرێکی دی لە سولەیمانی

ده‌داته‌وه‌، له‌ سالّی ١٨٨٤ له‌ "پێنجوین" "گه‌له‌نبه‌وی بورهـان: کـه‌ عیلمـی مه‌نتیقـه‌ له‌لای مه‌لا عه‌بدوره‌حمانی پێنجوێنی ده‌خوینیّ، له‌وێوه‌ دێت بۆ موکریان " ماوه‌یـه‌کیش له‌و نێوه‌دا هه‌ر به‌ فه‌قێیه‌تی ده‌سورێته‌وه‌ لـه‌ پاشـا رێـی ده‌که‌وێتـه‌ خانـه‌قای"شـێخی بورهان" واته‌ شێخ شه‌مسه‌دین و له‌ویّ ده‌که‌وێتـه‌ داوی ته‌ریقه‌تـه‌وه‌، لـه‌ شـێخ یوسـف "شێخی بورهان" ته‌ریقه‌ت وه‌رده‌گریّ و دوای ته‌واوکردنی خوێندنی ئایینی و ناوفه‌قێیان ده‌بێت ب مه‌لایه‌کی زانا و پایه‌به‌رز و ده‌چێت بۆ ئاوایی "سـاحێب"ی ناوچـه‌ی سـه‌قز و ده‌بێت به‌ مه‌لا و موده‌ریسی ئه‌م دێیه‌ و هـه‌ر لـه‌وێش ژن دێنێـت و دوای ماوه‌یـه‌ك لـه‌ ئاوایی ساحێبه‌وه‌ ده‌چێت بۆ دێـی "قـاراوا"ی ناوچـه‌ی بۆکـان و خـه‌ریکی مه‌لایـه‌تی و ده‌رسگوتنه‌وه‌ ده‌بێت و هه‌ر له‌م ئاواییه‌ به‌ هـۆی هۆنینـه‌وه‌ی چـوارینه‌یه‌ك سـالّح خـانی ئیعزا مول مولّك ئاغای "قاراوا" و "بۆ گه‌به‌سـی" کـه‌ پیـاوێکی سـاماندار و خـاوه‌ن ده‌سه‌لاّت و ده‌سرۆیشتوو بووه‌ ریشی ده‌تاشێت.

ئه‌م رووداوه‌ دلّته‌زێن و ناخۆشـه‌ بـه‌ جۆرێـك کـار ده‌کاتـه‌ سـه‌ر هه‌سـت و هـۆش و عاتیفه‌ی ئه‌م شاعیره‌ ناسك خه‌یالّه‌ که‌ ئه‌م زامه‌ قوولّ و کاریگه‌ره‌ تا دوا هه‌ناسه‌ی ژیانی هه‌روا ده‌مێنێته‌وه‌، هه‌ر وه‌کو له‌ پارچه‌ شیعرێك دا گوتویه‌تی:

شـــادی بێگانه‌یـــه‌، خـــزمم غه‌مـــه‌ گـــه‌ر مردیـــشم
ئـــه‌وه‌ وا ریـــس لـــه‌ حیـــسابی حـــه‌ق و گـــۆڕ و که‌فـــه‌نم
گـــه‌نجی فکـــرم کـــه‌ لـــه‌نێو کـــونجی غـــه‌ما دیـــوه‌ ئـــه‌وه‌
مـــولّکی شـــادیم هه‌یـــه‌ تـــا ســـاکینی به‌یتولحـــه‌زه‌نم

یا لە غەزەلێکی ترا تابلۆی ژیانی تاڵ و ناخۆش و پڕ لە ئازار و خەفـەتی خـۆی بـەم جۆرە وێنە دەکێشێت و دەڵێت:

هـــەوری خەفەتـــە بـــەفری غـــەمی داوە بـــە ســـەرما
یـــا سەرِســـەرِی دووریتـــە کـــەلێی کردمـــە ســـەرما
کەوتۆتـــە ســـەرم ئەشـــک و غوبـــاری ئەلـــەمی دڵ
یـــەعنی کـــە قـــورِی میحنەتـــە کردوومـــە بـــە ســـەرما

"حەریق"بە دڵشکاوی و ناچاری، پاشان بە خاوخێزانەوە ئـەو دێیـە بـە جێـدێڵێت و دەچێت بۆ گوندی "شەرەفکەند"و بۆ ماوەیەکیش لەوێدا نیشتەجێ دەبێ و لەو ماوەیـەدا خەریکی دەرسگوتنەوە بە فەقێیان دەبێ و پاشان دەچێت بۆ شاروێرانی ناوچەی مـەهاباد و چەند ساڵێکیش لە گوندەکانی ئەو ناوچەیەدا دەبێ بە مەلا و مودەریس و لە پاشان لە ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی دێتە شاری مەهاباد و دەبـێ بـە مـەلاو مودەریـسی مزگـەوتی حاجی "سەیید حەسەن" و محەمەد حسین خانی موکری مانگـێ سـێ تمـەن حقـوقی بـۆ دەبڕێتەوە. ئیتر پاشماوەی تەمەن و ژیانی دەکا بە پەپوولەی دەوری چرای "شێخی بورهان" و تا سـاڵی ١٩٠٧ زاییـنـی، ڕێکـەوتی ١٣٢٦ی کۆچـی مـانگی دوای ٥٦ سـاڵ ژیـانی شاعیرانە و سۆفیانە لە شاری مەهاباد لە گەڕەکی "ڕزگـەیی" یـان لـە خـانووی مـیرزا "حاجی یوسفیان" ئەو گەوهەرە تروسکەدارە بۆ هەمیشە لە گرشە دەکـەوێ و مـاڵاوایی لە ژیان دەکا و لە گۆڕستانی "مەلا جامی" لەتەنیشت ئارامگای خوالیخۆشـبوو شـێخ مەحمودی نەوەی شێخ تەهای شەمزینی سەری دەباتە نێو ئامێزی خاکەوە.

خوا بە گەورەیی خۆی گیانی بە بەهەشت شاد بکات.

***

## شیعری حەریق

حەریق شاعیری ڕێبواری ڕێگەی سۆفیایەتی و خاوەنی دڵێکی بە خرۆش و مامۆستای هۆنراوەی جوان و ڕاوچی نێچیری شیعر و هەڵۆی مەعنا و گەوهەری بیر و خەیاڵە و مامزی مەعنای بە تەواوی ڕاوی خۆی کردووە، ئەگەر بە ووردی سەرنجێك لە ناوەڕۆك و مەعناو مەبەستەکانی ئەو شاعیرەمان بدەین، شیعری عیرفانی و سۆفیایەتی زۆربەی دیوانەکەی گرتۆتەوە، چونکە عیرفان و سۆفیایەتی و خۆشویستنی "شێخی بورهان" بە تەواوی هەست و هۆشی داگرتووە و لە سەرجەمی شیعرەکانیدا ئەو کارتێکردنە بەرچاو دەکەوێت بە شێوەیەك کە گوتنی هۆنراوەی ئایینی و عیرفانی یا ستایشی "پیری بورهان" لە قوڵایی دڵ و دەروونیەوە هەڵقوڵاوە و بە درێژایی تەمەنیشی پەیڕەوی لێکردووە، بۆیە لە چەند جۆر هۆنراوەی ئایینی و عیرفانی وەکو شیعری "خۆف و ڕەجا" و "نوری محەمەد" و "دڵی غافڵ" و "خەرمانی ئەمەل" و "عەسری خەزەف" و "مەدینەی ئەمەل" و "غونچەی مەقسود" و "فەرشی غەزەل"دا زۆر زانایانە و شارەزایانە لە مەیدانی ڕەوانبێژی و جوانکاری و وردەکاریدا ئەسپی خۆی تاوداوە و هەست و سۆزی خۆی دەربڕیووە، هەر وەکو لە پارچە شیعری "خەوف و ڕەجا"دا گوتویەتی:

خــۆفم لــه خــودا، چــونکه لەبــەر غــەیری خودایــه
ئــەمنم بــه درۆ، ســورەتی وەک خــۆف و ڕەجایــه
پــالّی ڕەحــەتی داوەتــەوە نەفــسی خەسیــسم
یــا ئــەمنی غــەنا، یــا ئەســەری یــەئس و هەوایــه
بــارانی بــه ڕەحمــەت لــه تــەرف مەبــدەئی فــەییاز
قــەترێ ئەســەری ســونبول و یــەک چــقڵ و گیبایــه
نوقــسان لــه تــەرەف قابیلــه، نــەک فــاعیلی موختــار
ئــەم قــەولی منــه ڕەئیــی جــەمیعی حوکەمایــه

***

**یا له شیعری "نووری موحەمەد"دا گوتویەتی:**

بــەو نــووره کــه زاهیــر بــوو لەســەر ڕوویــی موحەمــەد
عالــەم هــەمو ئاشــوفته بــوو وەک مــوویی موحەمــەد
ســەروی چــەمەنیش پێــی لــه گــڵ و خــاری غەمایــه
لەرزانــه لــه حەســرەت قــەدی دڵجــویی موحەمــەد
بورهانــه لەســــەر نــــەفیی مونافــــاتی شــــەو و ڕۆژ
مــوێی کــه پەرێــشانه لەســەر ڕوویــی موحەمــەد

***

حەریق شاعیرێکی ژیری خاوەن هۆش و بیری بەرز و دووربینیش بووە و پێویستی خۆی بەرامبەر بە خودا و ئایین و عیرفان بەجێهێناوە، بۆیە چووە بۆ دنیای شیعری پڕ لە خوداناسین و سۆفیایەتیەوە و دەستیکردووە بە هۆنینەوەی ئەو هۆنراوانەی کە ناوەڕۆك و مەبەستەکەیان بریتییە لە خوداپەرستی و سۆفیایەتی و فەلسەفی و ستایش و بە سروشت هەڵگوتن، بە خوێندنەوە و موتالاکردنی شیعرەکانی بیری ئایینی و ڕێبازی عیرفانی حەریقمان بۆ دەردەکەوێ.

خەجالەت مەنحەسیر بوو ئەی دڵەی غافڵ لە دونیایە
نەدامەت بوو نەتیجەی ئاخری ئەم شۆڕ و غەوغایە
عەجەب بۆت بۆتە زستان زەمهەریری باری عیسیانت
کەشک نابەی سەرمایە، دەڵێی وەیوەی چ سەرمایە

لێرەدا ئەوەی پێویستە بگوترێت ئەوەیە کە یەکەم سەرچاوەی ئیلهام و خروشانی "حەریق" سۆز و هەوای ئەوین و سۆفیایەتی بووە کە کاری کردۆتە سەر دڵ و دەروونی بە جۆشی و هەر لەو کاتەوە کە هەوای عیشق و عیرفانی کەوتۆتە مێشکەوە بە شیعر ئاگری دەروونی دامرکاندووە، فەلسەفەی تەسەووفی "مەحوی" و شاعیرانی سۆفی، کاریان تێکردووە و لەسەر ئەوەشڕا بیروخەیاڵی ناسکی "نالی" شۆڕشێکیان لە دڵیدا کردۆتەوە، شیعرەکانی تام و مەزە و چێژی گیانبەخشی تەسەووفیان تێدایە و عیرفان و سۆفیایەتی لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا دەدرەوشێتەوە" بە خوێندنەوەی هەڵبەستە پڕ لە مەبەستەکانی ڕوانگەی بیری تەسەووف و ڕێبازی ئایینی و عیرفانی حەریقمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و بەو جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە "سۆفیزم" تا چ ڕادەیەك کاری کردۆتە سەر

شیعر و ئەدەبی کوردی و تا چ ئەندازەیەك سامانداری کردووە و بەرزی کردۆتەوە، هەر وەکو لە شیعری "خەرمانی ئەمەل"دا دەڵێ:

**لە خەرمانی ئەمەل میرووی عەمەل جەزبی نەکرد، دانێ**
**لە زەیقەت خانەدا ترسم هەیە، ئاخر سەری دانێ**
**دەڵێن جەردەی ئەجەل ڕێگا بە کاروانی نەفەس دەگرێ**
**شەقامی سینە دەبڕێ بۆ مەتاعی دیدە دەڕوانێ**
**تەریدەی نەفس و شەیتان قافڵەی تاعاتی غارەت کرد**
**ئەگەر جاسووسی ئیمانی نەبێ دەرناچێ ئینسانێ**

***

"حەریق" لە هەموو باخچە و گوڵزارێك چەپکە گوڵێکی چنیوە و ناوەڕۆك و مەبەستی هۆنراوەکانی بریتین لە:

١- ئایینی و خواناسی
٢- عیرفان و سۆفیایەتی
٣- فەلسەفی و کۆمەڵایەتی
٤- خۆشەویستی و دڵداری
٥- ستایش و پێهەڵگوتن
٦- بەهار و سروشت و جوانی

٧- شین و لاواندنەوە

٨- موناسەبات

٩- نامە و نامەکاری

١٠- داشۆرین و گلەیی

"حەریق" ئەوەندەی کە لە کوردیدا شاعیر و خاوەن بەهرە بووە ئەوەندەش لە شیعری فارسیدا شاعیر و شارەزا و خاوەن بیری بەرز بووە و لەپاڵ هۆنراوەی کوردیدا هۆنراوەی بە زمانی فارسیش هۆنیوەتەوە و کەشکۆڵ و بەیازەکان، چەند نموونەی ئەو بابەتەیان بۆ هەڵگرتووین.

دکتۆر "مەعروف خەزنەدار" زانا و نووسەری پایەبەرزی کورد لە پێشەکی دیوانی شاعیری موکریان "مصباح الدیوان"ی "ئەدەب" لە لاپەڕەی دوازدەدا دەڵێ: "حەریق" یەکێك لەو شاعیرانەیە، کە نوێنەری قوتابخانەی "نالی"یە لە خاکی باباندا، وە ئەم شاعیرانە واتە شاعیرانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم ئەگەرچی غەزەلی "نالی"یان لە رووی رووخسارەوە نەگۆڕیووە، بەڵام شۆڕشێکیان لە ناوەڕۆکدا بەرپاکردووە، "حەریق" و "مەحوی" بە دەروێشی، "حاجی بەنیشتمانی و"ئەدەب" بە دەرهێنانی غەزەلی دڵداری لە چوارچێوەی دەروێشییەوە، بۆ جیهانی ریالیزم، "حەریق" هەر لە سەرەتای لاوییەوە دەستی کردووە بە شاعیری و لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا سەوداسەر و شەیدای شێوە و شێوازی شیعرەکانی "مەحوی"و بە تایبەت "نالی" بووە و شیعرەکانی ئەوان لە شیعری ئەودا رەنگ دەدەنەوە، دڵی لە وردەکاری ئەو شاعیرانە چووە و گەلێکیشی حەز لە جیناس و تەشبیە و ئیستیعارەی جوان کردووە، بۆ نموونە تەماشایەکی ئەو کارتێکردنەی . "نالی" لە "حەریق" بکە و بزانە چۆن "حەریق" شوێن شێوە و شێوازی "نالی" کەوتووە، "نالی" دەڵێ:

چاوت لە برۆ یەعنی لەژێر تاقی نەزارەت

بێ پەردە عەیان دێتە تەکەللوم بە ئیشارەت

"حەریق" دەڵێ:

ئەم خوسرەوی خوبانە کەوا دێتە نەزارەت

شیرینە ئەگەر دڵ بڕفێنێ بە ئیشارەت

"نالی" دەڵێ:

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسسیەیی شاهن

ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن

"حەریق" دەڵێ:

ئەم تاقمە شیرینە لە مەکتەب کە دیيارن

جەللادی دڵی عالەم و ئاشووبی دیيارن

با چاوێکیش بە هەردوو چامە "قەسیدە"کەی "کچ"ی "نالی" و "کوڕی" "حەریق"دا بخشێنین و بزانین "حەریق" چۆن بە سەر ڕێچکە و ڕێبازی "نالی"دا ڕۆیشتووە و تەنانەت لە کێش و قافیەشدا پەیڕەوی لە "نالی" کردووە و شوێن پێی ئەوی هەڵگرتووە، "نالی" لە چامە ناسك و جوانەکەیدا کە باسی عیشقی مەجازی دەکات و دەڵێ:

عیـشقت کـه مـەجازی بـێ، خـواهیش مەکـە ئـیللا کـچ
شـیرین کـچ و لـەیلا کـچ، سـەلما کـچ و عـەزرا کـچ
فـەرقی کـورِ و کـچ ڕۆشـن وەک فـەرقی مـەهو میهـرە
ئـەم فـەرقی شـەو ڕۆژە وەک فەرقـە لـە کـورِ تـا کـچ

"حەریق"یش لە چامە بەرز و بەناوبانگەکەیدا باسی عیشقی حەقیقی دەکا و دەڵێ:

عیـشقت کـە حـەقیقی بـێ تالیـب مەبـە ئـیللا کـورِ
هـەم حـەزرەتی لـەولا کـورِ، هـەم یوسـفی والا کـورِ
ئـەو نـوورە کـە مەنـشەئبو، بـۆ عاشـقی مەبـدەئبو
تێفکـرە لـە ئـەو نـوورە مـەعلوم و هووەیـدا کـورِ
سـەد حـەیفێ کـە تـۆ "نـالی" بـەم پیرییـە منـداڵی
بـەم تـەرزە لـە عیـشق ئـەدوێ زیبـا کـچ و دیبـا کـورِ
هـەر عیـشقی حـەقیقی بـێ، وەک عیـشقی "حـەریقی" بـێ
مـەیلی بـە دەقیقـی بـێ، بـۆ مەعریفـە تـوللا کـورِ

***

هەر وەکو گوتمان "حەریق" شاعیرێکی سۆفییە و هێندێ لـە شـیعرەکانی عیـشقی مەجازین و سەریان لە تەسەووفەوە دەرچووە، واتـە لـە عیـشقی مەجازییـەوە چـووە بـۆ عیشقی حەقیقی و خودایی.

## حەریق و غەزەل

"حەریق" شاعیرێکی سۆفی و غەزەلوێژێکی بەهرەمەندی دوای "نالی" و "مەحوی"یە، ناوبانگی "حەریق" زیاتر بە هۆی غەزەلە بەرز و جوانەکانیەتی کە بەڕاستی مەعنای باریك و وشەی جوانی وەکو گەوهەر و یاقووتی لە ملوانکەی هۆنراوەدا تێکەڵ کردووە و لە شیعر و غەزەلەکانیدا ڕۆحی عیرفانی و خواناسی بە تەواوی دیاری دەدا:

بە کەمەندی غەمی دونیا کەسێ خۆی پێچا بێ
موتڵەقی قەیدی تەکالیفەکە خۆی پێ چا بێ
ئەوی خاوی تەمەعە کەوتۆتە حاڵی چاوی
چۆن لەبەر ریس و گوریسی لە غەزەل جۆیابێ؟
حیکمەتە شیعری من و دەوڵەتی ئەهلی ئیمساک
وەک تەلەسمێکە کە ڕێی مەشرەبی بۆ نەشکا بێ



ڕێچەکە و داڕشتنی شیعرەکانی "حەریق" بە تێکڕایی شێوەیەکە لە نێوان غەزەلی دڵداری و سۆفیانەدا، یانی عیشق و سۆفیەتی تێکەڵا و کردووە و بیر و خەیاڵی سۆفیانەی لە ناوەڕۆکی غەزەلی دڵداری و ئەویندارییدا گونجاندووە.

**چاوەکەم ئەمڕۆ لەگوڵشەن گوڵ بەعیشوە خۆی نوواند**

**نەک نمەکگیربم بەمەرگی تۆ قەسەم هیچ نەم دوواند**

**گوڵ بە تۆزی پێتەوە لاف و گەزافی لێ دەدا**

**وا شوکر سۆزەی نەسیم هات و ئەویشی لێ ستاند**

**بۆ گوڵی ڕووت ماتەمی پەرچەم دەبینێ بۆیە وا**

**ماهی نەورۆزم بە شێوەن وەک محەڕڕەم خۆی نواند**

"حەریق"لە تین و تاوی ئەوین و خۆشەویستی دا بە هێزبووە و بەهەست و سۆزی سۆفیانە و عاریفانەوە ئاگری هێناوەتە نێو ئاورگی دڵ و بووە بە شاعیر و ئەدیبی فێرگەی عیشق و بووە بە ڕێگری دڵەکان، بە ڕاستی ئاگری عیشق لە دڵی "حەریق"دا هەستاوە و بڵێسەی ئەستاندووە و سووتاندویەتی، بۆیە بە غەزەلە بەرز و بە سۆزەکانی ئاگری لە خەرمانی دڵانی بە هەست بەرداوە.

**کەی دێیەوە سەر ڕەحمی دڵی زار و نەزارم؟**

**کەی دێ قەدەمی خێرت بەسەر خاکی مەزارم؟**

**تا دیومە لەنێو مەسحەفی ڕووت سورەیی یۆسف**

**بۆ ئایەتی حوسنت لە هەموو ڕەسمێ کەنارم**

تـــاووس کـــە لەســـەر زینـــەتی بـــاڵی، ســـەری دانـــا
ئـــەمنیش بـــە پـــەڕی فیکـــرەوە بـــێ ســـەبر و قـــەرارم
پەروانـــەیی شـــەوقت مەخـــەرە ئـــاگری میحنـــەت
شـــەمعی دڵەکـــەت هەڵکـــە لـــە بـــۆ بـــەزمی نیگـــارم

❊❊❊

"حەریق" بە جوانترین شێوە ناوەڕۆکی ئایینی و عیرفانی وە بەرزترین بیری سۆفیانە و فەلسەفی و بە سۆزترین ئازاری ئەویندارانـەی لـە غەزەلەکانیـدا دەربڕیـوە و تەنانـەت زۆربەی غەزەلە دڵدارییەکانیشی ڕەنگی غەزەلە عیرفانییەکانی بەخۆوە گرتووە.

بـە خـەیاڵی شـەوی وەسـڵت خـەوی هیجـرانم دی
بـــە شـــەمیمی نەفەســـت ســـروەیی حیرمـــانم دی
چـــاوی بیمـــارت ئیـــشاراتی شـــفا دەنوێنـــێ
لـــە خـــەتی مەســـحەفی روت ئایـــەتی لوقمـــانم دی
گەوهـــەری مـــەعنی لـــە دەریاچـــەیی دڵ دێنمـــەدەر
تـا لـە حۆقەقـەی دەهـەنت لـە علـی بەدەخـشانم دی
هەر بـە ئـاودا چـوو سـەفینەی غـەزەلی بـەحری خـەیاڵ
لـــە جییـــات ســـوودی مـــەتاعم زەرەر و زیـــانم دی
لەگـــەنی دیـــدە، فتیلـــەی مـــوژەوورە وغـــەنی ئـــاه
بـــۆ شـــەوی وەســـڵی لـــە ســـەد لاوە چـــراغانم دی

ئەو هۆنەرە هەنەرمەندە ئەویندارێکی دڵسووتاوەکە ڕایەڵ و پۆی غەزەلەکانی لە هەست و سۆز و ئەوین و خۆشەویستی چنراون و لەسەر ڕوپەڕی دڵان نەخشکراون، لەسەرتاسەری ئەم غەزەلانەدا ئەوینێکی ئاگراوی و سۆزێکی ڕاستەقانی شەپۆل دەدا و غەزەلەکانی بە ڕاستی دڵ دەکەنەوە و بەبێ پەروا ئینسان دەخەنە سۆزێکی مەعنەوی و رۆحێکی ڕۆحانی و ئەویندارانەیان هەیە.

بـــۆ جـــەمعی غـــەم و شـــادی نـــەبوو ڕۆژی موحـــەررەم
ڕووت بـــەرگی گـــوڵی شـــادی و زوڵفـــت شـــەوی ماتـــەم
بـــەو وەجهـــە دەڵـــێن مەســـحەفو بـــەو نوقتـــە دەڵـــێن دەم
بـــەو زوڵفـــە دەڵـــێن قەیـــدو بـــە ئـــەم حاشـــییە پەرچـــەم
تەفـــسیری شـــەوی وەســـڵ و غـــەمی ڕۆژێ فیراقـــە
مەشـــهورە لـــە دونیـــا بـــە بەهەشـــت و بەجەهەننـــەم
تەســـبێحی ســـەنای زوڵفـــی خەیاتـــە و لـــەبی مـــەرجان
ســـەر ڕیـــشتەیی ئێمـــەی دەوێ بـــۆ عیقـــدی مونـــەززەم
بـــۆ دڵبـــەری مـــەعنی لـــە حـــەرەم خانـــەیی ئەســـرار
خـــۆی و قەڵـــەمی مـــاوە "حـــەریق" ئێـــستێ بەمـــەحرەم

***

ئەو بویێژە خۆش ڕاوێژە لە دەربڕینــی بیروخــەیاڵ و پــەروەردەکردنی نــاوەرۆکی تــازە و بەکارهێنانی ئیستعارەی جوان و تەشبیهاتی ناسـك و داهێنەرانـەدا بـە هێـز و خـاوەن دەسەڵات بووە و غەزەلـە شیرین و دڵفڕێنـەکانی چـون لـە قـوڵایی دڵـی بەهەستیەوە هەڵقوڵاون لەگەڵ دونیایەك هەست و سۆز تێکەڵاون.

ئــەی تۆبــە لــە دەس ڕۆژی فیــراق و شــەوی هجیــران
وەی ڕۆ لــە هــەرا و کەشمەکەشـــی ســاعەتی حیرمـــان
بـــۆ ســـەبزەیی نـــەوخێزی خـــەتی لالـــە روخـــانم
هـــەوری خەفـــەتم حـــازرە بـــۆ دیـــدەیی گریـــان
تــۆ تــاری ســەری زوڵـف و منــیش ئەشــکی بەحەســرەت
خــۆش دێــن لەیــەک ئــەو ڕشــتەوو ئــەو دانــەیی مــەرجان
قــەترەی عــەرەقی شــەونمی بــەرگی گــوڵی روت بــو
وەمزانـــی کـــە مەرجانـــە لەســـەر لـــەعلی بەدەخـــشان

"حەریق" دەنـگ و نالـەی دەروونـی لـە قـالبی غـەزەلی ناسـك و تـەڕ و پـاراودا هۆنیوەتەوە و هۆنراوەکانی نیشانەی سـۆزی ئەویندارانـە و عیرفانییـەتی، غەزەلـەکانی پارچە ئاگرێکن کە لە کوورەی دڵی ئاگرینەوە هاتوونەتە دەرەوە و دەکرێ بڵێین بە تەواوی مەعنا "حەریق" شیعری شاعیرانە و عاریفانەی هۆنیوەتەوە.

هـەموو کـەس بـا بزانــێ مــن کەسـەودای زوڵفــی دوتــاتم
لـە خانـەی کوڵمــدا کـۆڵم لـە دەوری شـای روخـت مـاتم
ئەگەرچی ساکینی ملکی عەجـەم بـووم دور لـە رۆم کـەوتم
لــە ســایەی پەرچــەمی تـۆوە رەئیــسی ملکــی شــا مــاتم
موتالای حاشییەی زوڵفـت لەسەرسـەفحەی روخـت سـەعبە
بـەوەم چــابوو بــە منــداڵی لــە دەرســی عیــشق راهــاتم

"حەریق" زۆرجاریش بەرە و غەزەلی ئەوین و دلداری ڕۆیشتووە و لـەم مەیدانەشـدا سوارچاکی خۆی تێدا تاقیکردۆتەوە، ئەگەر بەوردی باسی ئەوین و خۆشەویستی یـان بـە ئاشکرایی تێدا دیارە و ویستوویەتی لە هەموو ڕوانگەیەکەوە شـیعر بڵـێ و خـۆی لـەم بوارەشدا تاقیکردبێتەوە.

حــوزنی مــن یــا حوســنی تـۆ ئیــشکا لــە تــا ئــاخر نەفــەس
چــۆن زەکــانی حوســنی تـۆ یــا حــوزنی مــن ناگــا بــە کــەس
چـۆن دەکـەی مـەنعی دڵـی مـن تـۆ لـە شـەهدی لێـوی خـۆت
لێــوی تــۆ وەک شەککرســتانە دڵــی مــن وەک مەگــەس
تــازە فەرمووتــە لــە لای کــەس ڕازی عیــشقی مــن مــەڵێ
نـەت دەزانــی دڵ کـەکون بـوو دەنگـی لێـدێ وەک جـەرەس؟

"حەریق" بایەخێکی زۆری بە شیعرەکانی خۆی داوە و زۆری خۆش ویستوون و بەهۆی هۆنراوەکانییەوە خۆی بە وەجاخ ڕۆشن زانیوە و هەڵبەستەکانی بە جگەرگۆشەی خۆی داناون و هیوای پاشەڕۆژی پێیان بووە و بە موشتەری و داخوازی شیعرەکانی گوتووە کە ئەو هۆنراوە بەنرخ و جوانانە لەکیس خۆیان نەدەن، هەر وەکو لە چامەی "عەسری خەزەف"دا کە وتویەتی:

هەریەک پەلی فرزەندێ، دەژی شیعری "حەریقی"

تۆ بۆچی لەکیس خۆتی دەدەی موشتەری نادان؟

## حەریق و شێخی بورهان

حەریق لە کۆڕی ڕەوانبێژی دا بولبولێکی هەزاردەستانە کە دڵ بە دەریادا دەدا و ڕوو لە خانەقای "شێخی بورهان" دەکا، کاتێ کە چووە بۆ خانەقای "شێخی بورهان"و لەوێدا نیشتەجێ بووە، تا دوایی ژیانی لە سۆز و گودازی عیشقدا گۆشەنشین بووە و پشکۆ ئاگراوییەکانی ئەوینی ڕاستەقانی لە دڵ و دەروونیدا بڵێسەی ئەستاندووە و ئاگری لە خەرمانی ژیانی بەرداوە، بەڕاستی لە دونیای عیشق و شەیدایی، سۆز و گوداز و خۆشەویستی دا کەم وێنەبووە:

ئەی دڵ وەرە شادی کە لە بۆ بەزمی ویسالت
وا دیومەتەوە دڵبەرەکەی تازە نیهالت
زاتێکە موبەڕڕایە لە ئەنواعی نەقائیس
ئیتر چ دەڵێی دەرحەقی مەفقودە مەجالت
پێی بێژە لە بۆ شەوکەتی تۆ فەخری زەمانە
پا بۆستە ئەرز و فەلەکیش چەتری جەلالت
پەروازی نییە بولبولی دڵ بۆ تەرەفی گوڵ
تا دیویەتی پەروانە سیفەت شەمعی جەمالت

"حەریق" شاعیرێکی سۆفی بووە واتە ڕێگەی سۆفیایەتی گرتووە و بڕوایەکی پتەوی پێیان بووە بە تایبەت بە شێخەکەی خۆی واتە شێخ یوسف شەمسەدین، حەریق بە تەواوی گەردن کەچی "پیری بورهان" بووە و بەو پەڕی گەشە و زەوقەوە ڕووی بەلای ئەودا وەرگێڕاوە و بەردەوام خەریکی دانانی هۆنراوەی ڕەوان و پڕ لە سۆز بووە بۆی، هەروەکو لە هەڵبەستی "مەدینەی ئەمەل"دا دەڵێ:

تاریکە دڵم ڕەوشەنییێ شەمسی هیدایەت
نوقتەی دڵەکەم مەبدەئی هاتۆتە نیهایەت
ئەی پادشەهی ملکی ویلایەت بە عەدالەت
مەزڵوومی شەڕی نەفسم و هاتوومە شکایەت
"بورهان" وەکو "کەنعان" و "شەرەفکەند" کە "میسر" بوو
کردت بە مەدینەی ئەمەل و کەعبەیی غایەت
هەم "شەمسی" بە ئیسنادییو هەم قوتبی بە ئیرشاد
ئەو خەرقە بەسە، بۆ نەزەری ئەهلی کیفایەت

"حەریق" سووتاوی چرای ڕووخساری شێخ شەمسەدین بووە و بەهۆی ئەو شێخە بووە کە دڵ و دەروونی خرۆشاوە و قەریحەی شیعری کراوەتەوە و هەر ئەویش بۆتە هۆی هۆنینەوەی ئەو هەموو هۆنراوە بەرز و بە هێزانەو لە زۆربەی هەڵبەستەکانیدا سۆز و ئارەزووی خۆی بۆ گەیشتن بە شێخەکەی پیشانداوە:

لەسەر سەودای قوماری شاهی خوبان "پیری بورهانی"
بە چەوگانی ئیرادەت گۆی سەرم بۆ بازی داناوە
بە قوربانت بم ئەی پیری خەراباتی جیهان ئاباد
بە شاهیدبە کەوا رووحم لە رەهنی قوربی تۆناوە
شەهی ملکی یەقین، شاهنشەهی دین، پیری با تەمکین
رەئیسی ئەولیبیا رەحمێ هەتا دڵ رێی نەبەستراوە

دەرسی جنونی مەلا ساڵحی حەریقیان لە سورەی یوسفدا نووسیوە و بۆ پەرەپێدانی سکەی دین هەموو خەراجی میسری بیر و خەیاڵی خۆی بە جوانی "یوسف" بەخشیوە"

کتێبی عیشقی مەجنون ئایەتی ڕووخساری لەیلایە
لە سورەی یوسفا درسی جنونی ئێمە نوسراوە
کەسێ فیترەت بلند بێ بۆ ڕەواجی سککەیی دینی
خەراجی میسری قەلبی خۆی بە حوسنی "یوسفی" داوە

حەریق سەدان کەس لە پیاوانی خوا وەکو "مەنسور" و هەزاران کەسی وەك "شبلی" لە ڕیزی مریدەکانی شێخ دا دەبینێ کە هەموویان بە هەوای تێگەیشتن و ناسینی شکۆ و گەورەیی شێخ گەسك لێدەری دەرگای ئەون، لە پاشان بەوپەڕی شانازیکردن و خۆشەویستی و ڕاستی و دروستییەوە سەر لە مەیدانی مریدانیدا دەنێ و بەکینایە خۆی لە ڕیزی ئەوان دەژمێرێت و دەڵێت:

سـەد هـەروەکو مەنـسور و هـەزاری وەکـو شـبلی
جارۆکەشـی دەرکـن بـە هـوای دەرک و دیرایـەت
سـەردانێ لـە مەیـدانی مریـدانی "حـەریق" ی
بـۆ گـۆیی شـەقێن چـاکە خۆشـت کـوت بـە کینایـەت

غەزەل و چامەکانی "حەریق" پڕن لە ئاگری ئەوین و هەست و سۆزی خۆشەویستی و خواناسی و هەر خاوەن دڵێ ئەم غـەزەل و چـامانە بخوێنێتـەوە ئـاگر لـە دڵ و گیـانی بەردەبێت، چۆن زۆربەی چامە و غەزەلەکانی بیر و خـەیاڵی عیرفانییـان تێکـەڵاوە و بـۆ گەیشتن بە خوا پیاڵەی بادەی لاهوتی لە مـەی گێـڕی کـۆڕی عاریفـان و سەرخۆشـانی خواناسدا داواکردووە.

خـوُدا عـومرت بـدا بـاقی، وەرە سـاقی بـدە ڕاقـی
کـە تـۆ هـەمڕازمی مـەی بێنـە بـۆ دەرمـانی دەردانـم
بە ڕەنگی ئەشـکی خـوێنینم کـە ڕووسـوورم لـە قـاپی حـەق
لـە فـەیزی تۆوەیـە سـاقی بەجۆشـە ئـاوی گریـانم
لـەنێو ئاتەشـکەدەی غەمـدا کـە بـابی دڵ ئـەوا بـرژا
شـەراب بێنـە بەپەیمانـە تـەواوە عەهـد و پـەیمانم

له زۆربەی غەزەل و چامەکانیدا سەوداسەرانە و ئەویندارانە ئـەوین و خۆشـەویستی خۆی سەبارەت بە شێخی بورهـان دەربڕیـوە و ئـەم پـیرە پـیرۆز و ڕوونـاك دڵـە بـووە بـە سەرچاوەی خرۆشانی زۆربەی غەزەل و چامەکانی، بۆ وێنە لە چامەیەکی بەرز و بـەهێزدا لەپێشا بە شێوەی چامەوونێژە گەورەکان چامەکە بە تەشبیب و غەزەلێکی گیان پەروەر و دڵ نشینەوە دەستپێدەکات و زۆر مامۆستایانە و شارەزایانە ستایشی شـێخەکەی دەکـا و لـە پاشـان بـە وەسـفکردنی سروشـت چـامەکەی بـە تازەکردنـەوە و دووپاتکردنـەوەی سەردێڕێکی دیکە دەسـتپێدەکات و بـە ستایـشکردنی مورشـیدی تەریقـەت حـەزرەتی شێخی سیراجەددین و کوڕەکانییەوە چامەکە دوایی پێ دێنێت و دەڵێ:

"سیراجەددین" بە نووری حەق بە هەر شەخسێ بـەهای دابـێ
بـە شەمـسی ڕوی "حیـسامەددین" وەفـا کابـێ "زیبیـا" نابـێ
بەسـەر خـاکی وجـودی تالیبـان ئیکـسیری ئـەلتافت
مـسی قـەڵبی قـەلب خـالیس دەکـا گـەر عەکـسێ تێـدا بـێ
لـە دیباجـەی کتێبـی حوسـنی عەلـەم هـەر وەرەق لادەم
دەبیـنم مەبحەسـی وەسـفت لەهـەر فەسـڵ و لـە هـەر بابـێ
بـە عیـشقی شـای سـیراجەددین و شـەوقی "بولوەفـا" جانـا
کـەرەم فـەرموو وەکـو دێـژن نەزانـستم بـەزانا بـێ

حەریق بە تەواوی شێخی بورهانی خۆشویستووە و دڵی بە ئاگر و مەشخەڵی ئەم خۆشەویستییە ڕووناك بووە و ئەم خۆشەویستییە کارێکی تەواوی کردۆتە سەر ڕۆحی ناسکی و هەست و هۆشی شاعیرانەی داگرتووە.

لــە دامێنـــی خــەیاڵم دامــەنێ گــوڵ بــچنە ئــەی شــاهید
بــە شــەرتێ شــاهی شەمــسەددین لــە دڵمــا جیلــوە ئارابــێ
نموونــەی ئینقیــادو سەرکەشـــی بـــۆ ســـەردییو گـــەرمی
کە موخلیس حاڵی گــەرم و مــونکریش دڵ ســەردە تــا مابــێ

بــە بەڵگــە بــۆی ئاشــکرا بــووە کــە "پــیری بورهــانی" یەکێکــە لــەو شــێخە هەڵکەوتووانــەی پێــشوو کــە جێگــای قــازانجی تــەواوە بــۆ ئــەو کەسانەی بیانــەوێ بەهرەی دەروونی وەربگرن، هەر لەبەر ئەوە هەست و سۆز و خۆشەویستییەکی بێ سنووری بووە بەرامبەری، ئەم هۆنــەرە بە کورتی هەتا دوا پلەی ژیــانی وازی لــە وەفا و خۆشەویستی و پەیوەندی دەروونی لەو زاتە نەهێناوە، هەر وەکو لە پارچە شیعری "خزری ڕێگەدا دەڵێ:

ئـــەی خـــزری رەهـــی زوڵەمـــەتی ســـەرئاوی حـــەیاتم
بـــۆ شەمـــسی روخـــت ســـاکینی قـــەعری زوڵومـــاتم
بـــۆ دەیـــدەیی یـــەعقوبی خیـــرەد یـــەک نـــەزەری تـــۆ
خاســـــییەتی پیراهـــــەنی کردۆتـــــە خـــــەلاتم
تـــۆ شـــەمس و منـــیش زەڕەیـــی بـــی جلیـــوە بـــە قوربـــان
نیـــسبەت هەیـــە، عـــەیبی چـــییە جویـــایی بـــەراتم

***

## حەریق و بەهار و سروشت و جوانی

"حەریق" هۆنەرێکی هونەرمەند و بەرز و بەهرەدار و خاوەنی بیری قـووڵ و خـەیاڵی ورد و هەستی ناسك و دڵی پڕ سۆز و شەیدای بەهار و جوانییەکانی سروشـت بـووە، لـە باسی گوڵ و گوڵزار و دیمەن و چاوەندازی جـوانی سروشـتدا گـەلێك مـەعنای ناسـکی هۆنیوەتەوە و هەستی جوانی دەربڕیـوە و زۆر شـاکاری بـەرز و کەموێنـەی لـە قـاڵبی جیناس و جوانکاری وردەکاری بەدیعدا هۆنیوەتەوە، وەك هونەر مەنـد و نیگارکێـشێکی لێهاتوو جوانترین و خۆماڵیترین تابلۆی وێنەی جوانی سروشتمان بـۆ دەکێـشێ، سـەیرکە چەند بە هەست و سۆزی ناسك ڕوو دەکاتە بەهەشتی پـڕ لالـەزاری کوردسـتان و باسـی بەهاری ڕەنگینمان بۆ دەکات:

قەمـــەر کەوتۆتـــە میزانـــی خـــەیاڵم موشـــتەری بـــا بـــێ
لـــە عیقـــدی نـــەزم و نەســـرم تـــالبی عیقـــدی ســـورەیا بـــێ
جـــەماڵی دڵبـــەری فکـــرم لـــە خەڵوەتـــدا بـــوو تـــا ئێـــستا
بـــــلا بـــــا دڵبـــــەر ئارابـــــێ، قـــــەبووڵی ئـــــەهلی ئارابـــــێ
لـــە مـــوژدەی نەوبـــەهار و غولغـــولی بولبـــول لـــە دەوری گـــوڵ
وەکـــو قـــومری دەبـــێ تـــۆقی وەفـــای ســـەروم لـــە ملـــدابێ
نەفـــەس دەم، دیـــدە پـــڕ ئـــاو و سەماوەرسـینە،جەرگ ئاتـــەش
کـــەلامم قەنـــدە گـــەر ســـاقی لەگـــەڵ مـــن ئـــارەزووی چـــا بـــێ

خـــەلاّتی شـــاهی نـــەورۆزی نیـــشانەی ئاتـــەش ئـــەفرۆزی
نەســـیم هێنـــای بـــە دڵـــسۆزی دەڵـــێ سـۆزی جـــەفا نابـــێ

رەئیـسە هــەور و تۆپــچی رەعــد و تــۆپ بــەرق و نیــزام بــاران
نەســـیم پێـــشڕەو، تەلیعـــە تـــەرزە، فەڕاشـــی دەبـــێ، بابـــێ

لـە دەنگـی رەعـد و ڕەنگـی بـەرق و ناڵـەی هـەور و گرمـەی بـا
کـەڕ و کـوێر بـەفری تـایین، مـەر هەناسـەی سـەردی پێمابـێ

لەشەوقی گوڵ، لـەزەوقی مـول، عەجـەب سەرخۆشـە ئـەهلی دڵ
دەوێـــژن تـــا ییفـــەی خوبـــان مەگـــەر جەننـــەت بـــە دونیابـــێ

حەجەر هەر وەک شەجەر نـاتیق بەسیرڕی قـودرەتی حـەق بـوو
کەســـێ حـــاڵی ببـــێ حـــاڵی دەبـــێ گـــەر ئـــەهلی بینابـــێ

نیـــشانەی نیعمـــەتی عوقبـــا لـــە دونیـــادا هووەیـــدا بـــوو
کەسـێ بـاوەڕ بــە مــن ناکــا لــە ڕەنگـی ســەوزە جویــا بــێ

عــەتای موتڵــەت بــە غیــری خــالیقی حــەق بــۆ درەختــی ڕەق
بــە کــێ دەکــرێ هــەموو ســاڵێ شــکۆفەی ســەبزی پێــدابێ؟

***

## حەریق لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا
## عەلائەددین سجادی (١٨٥١-١٩٧٥)

کڕیاری کاڵای بازاڕی بوێژان، سووتاوی باڵای دەستەبرای کیژان، دڵی بولبـولی دەوری گوڵی تیولۆژی، زمانی پاسەبانی باخچەسەرای وشەی خـۆش بێـژی، فیکـری بـووکێکی ڕازاوە بە ئارایشی هەمەڕەنگە، وێنە ئەداتەوە بە شیعری تەڕی تـاپێی بڵـێن قەشـەنگە، گاهێ لە سۆزی عەشقی مەجازیدا زمان پاراوێکی بێ وێنـە، گاهـێ لـە یـادی "پـیری بورهانی"داستاغوانێکی دڵ خوێنە، کەللەی تەمی کردووە کە دیویە "نالی" باسی کچی کردووە، سەمتووری دەنگیداوەتەوە ئەم باسی کوڕی کردووە، یا پابەندی مەولەوی کە بوو بـە پەپوولـەی شـێخ سـیراجەددین، خـۆی کـرد ئـەمیش بـە گوڵەبـەڕۆژە لـە دەوری شەمسەددین، سەرەڕای ئەمانە بوونە ئەفسانە، سینەی بەتیخی جـەوری زەمانـە، ئـەنجن ئەنجنە و ئەلهای دەرمانە!!

شاعیری دڵـسووتاوی ئـەم مەیدانـەمان نـاوی "سـاڵح"و کـوڕی مـەلا نەسـروڵڵای زیویەییە، زیویە گوندێکە لە سورداش لە لیوای سولەیمانی، پاڵی داوە بەلای ڕۆژهەڵاتی کێوی "پیرەمەگرونە"وە مەلا نەسروڵڵای باوکی زایندەی دیی کاشـتەرە، لـۆن و کاشـتەر دوو گوندن پاڵیانداوە بە کێوی "شـاهۆ"وە، کـە کەوتۆتـە بـەینی هـەورامانی لهـۆن و جوانڕۆ، دیوی جنوبی پاڵیـداوە بـە ماهیدەشـتەوە، مـەلا نەسـروڵڵا بـە فەقێیـەتی لـە وڵاتەکەی خۆی پەرت دەبێ و لەپاشا بە مەلایـەتی لـە دێـی زیویـە دەگیرسـێتەوە و ژن

دێنێت، ساڵحی شاعیری ئێمه لەو دایکه و لەو باوکه لە ساڵی "١٨٥١"ی میلادی لە گوندی زیویه دێته دنیاوه، لەلای باوکی سەرەتای خوێندن دەستپێدەکات، لە پاشان دەچێته سولەیمانی لە مزگەوتی شێخ موحەمەدی بەرزنجی ئەبێ بە سوختەی فەقێیان، گەشتێکی قەرەداغیشی هەیە، لە بیارەش باسی نیکاح لە کتێبی "منهاج"ی نەوەوی لەلای شێخ حەیدەر ئەخوێنێ، سەرێکی تر لە سولەیمانی ئەداتەوه، لە"١٨٨٤" لە پێنجوین گەلەنبەوی بورهان کە عیلمی مەنتیقه لەلای ئەورەحمانی پێنجوێنی ئەخوێنێ، لەوێوه ئەچێ بۆ موکریان، ماوەیەکیش لەو ناوەدا هەر بە فەقێیەتی ئەسوڕێتەوه لەپاشا ڕێی ئەکەوێته خانەقای "شێخی بورهان"لەوێ ئەکەوێتە داوی تەریقەتەوه، لە شێخ یوسف شەمسەددین "شێخی بورهان" تەریقەت وەرئەگرێ، لەپاشا لە سابلاخ ژنی هێناوه، کوڕ و کچێکی بووه، ئیتر پاشماوەی ژیانی ئەکا بە پەپوولەی دەوری چرای شێخی بورهان، تا لە "١٩٠٧"ی میلادی لە تەمەنی "٥٦" ساڵیدا کۆچی دوایی ئەکا و لە گۆڕستانی "مەلاجامی" لە "سابلاخ" ئەنێژرێ، خاوەنی ئەم باسەی ئێمه پیاوێکی میانه باڵا و گەنمڕەنگ بووه، چاوی پڕوپوش و بچووك بووه، ڕوومەتی مەیلە و درێژ بووه، ڕیشێکی تۆپ و بەشی زیاتری سپی بووه، زمانپاراو و بە ئەهوەنی قسەی کردووه، مێزەرێکی سپی سابلاخیانەی لەسەر ناوه، گوزەرانیشی وەنەبێ خۆش بووبێت.

ئایا چی مەلا ساڵحی هەڵخرانبێت بۆ ئەوەی خۆی باوێژێتە کۆشی شیعرەوه؟ ئایا کەمەندی نازی نازداران بووبێت؟ یا تاڤگە و گوڵاڵەی سەرچاوەی کوێستانان؟ یا کۆیلەیی و کەساسی و دەربەدەری شاران؟... ڕەنگبێ ئەمانە هیچیان نەبووبن، بەڵکو سۆزێکی فیتری و کەمەند کێشێکی دەروێشی تێدا بووه، بەڵام تەنها سۆز و هیچی تر، نەیزانیووه ئیتر ڕوو لە کوێ ئەکاتەوه، ئەم هەستە ناچاری کردووه بە خوێندنەوەی دیوانی شاعیرەکان، بە تایبەتی پابەندی"مەولەوی" و "نالی" بووه، لە دەوری ناوەڕاستی

فەقێیەتی داکەوتۆتە گڕوگاڵ، لەبەر سووتانی پەروانەی دڵی بە دەور مۆمێکی نادیاریدا "حەریقی" کردووە بە ناوی شیعری، کە پێشکەوتووە بۆ لای ئەو مۆمە شۆڕشەکەشی پێشکەوتووە، لە سەرەتاوە شیعرەکانی ئەوەندە بەجۆش نەبوون و زۆرگرانیش بۆی هاتووە، لەپاشا کە مۆمی خۆی ئەبینێتەوە کە شێخی بورهانە، سەرچاوەی شیعری وەکو کانیاوی بەهار هەڵدەقوڵێ، لە دەوری ئاخردا سۆزی عەشقی شەمسەددین وای لێکردبوو هەرکە قسەی ئەکرد قسەکانی شیعربوون، زۆر حەزی بە جیناس و عیبارەت ڕەنگینی کردووە، زۆر بە شانازییەوە وتوویەتی:

بێرە مەیدانی فەساحەت ئەسپی خۆت لنگ دە "حەریق"
تا بزانم کێ بە شیعرت سوحبەت و یاری ئەکا؟

ئەم قسانە وای لێکردووە لەگەڵ "نالی"دا کەوتوەتە پەنجە بازییەوە وەکو پێی ئەڵێ:

سەد حەیفێ کە تۆ "نالی" بەو پیرییە منداڵی
بەم تەرزە لە عیشق ئەدوێی، زیبا کچ و دیبا کوڕ

ئەم شیعرەی لەو بڕە شیعرەیەتی کە سەرەتای ئەکاتەوە بە:

عەشقت کە حەقیقی بێ تالیب مەبە ئیلا کوڕ
هەم حەزرەتی لەولا کوڕ، هەم یوسفی وا لا کوڕ

ئەمەی بەرامبەر بەو بڕە شیعرەی "نالی" وتووە کە سەرەتاکەی ئەڵێ:

عەشـقت کـە مـەجازی بـی خـواهیش مەکـە ئـیلا کـچ
شـیرین کـچ و لـەیلا کـچ، سـەلما کـچ و عـەزرا کـــچ

شانی لە شانی مەولەویش داوە، کە چۆن مەولـەوی پەروانـەی شـێخی دەوڵەمەنـد سیراجەددین بووە و بە بڕە شیعرەکەی کە بە:

شـــــێخی دەوڵەمەنــــد بـــــەهرەی ســـــەرمەدی
یاگـــــەی حەقیقـــــەت جلـــــوەی ئەحمـــــەدی

سەرەتای ئەکاتەوە و سۆزی خۆی بەرامبەر بە شێخی خۆی دەربڕیوە، ئەمیش بووە بـە پەپوولەی شێخ یوسف شەمسەددین و بڕە شـیعرە شـێوە هەورامیەکـەی، کـە سـەرەتای ئەکاتەوە بە:

جەســـوب ســـەحەردا دیـــم غونـــچە دەمـــێ
نـــە پـــەردەی عیـــسمەت نمـــا ناچـــەمێ

وەگودازی خۆی بەرامبەر بە شێخی خۆی دەرئەبڕێ، ئێستە ئەتوانین بێینە سەر ئـەوە کە باس لە هەندێ لە شیعری حەریقەوە بکەین بۆ ئەوەی پایەیمان لە مەیدانی ئـەدەبیاتا بۆ دەرکەوێ، ئەو ڕێگایانە کە لە شیعردا گرتوونی بزانین چ جۆرە ڕێگایەکن لـە ئـەدەبی کوردیدا؟...

"حەریق" لەدەوری ناوەڕاستی عالەمی شیعردا ئەبێ، پەیکەری نیگارێکی پەری ئامێز قاپی باغچەیەکی تەبیعەتی بۆ ئەخاتە سەرگازی پشت و وە ئەمیش پێ ئەنێ بە جەرگی خۆیا ئەچێتە ئەو گوڵشەنەوە و پێی دەڵێ:

چاوەکەم ئەمرۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند
نەک نمەک گیربم، بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەم دواند
گوڵ بە تۆزی پێتەوە لاف و گەزافی لێ ئەدا
وا شوکر سۆزەی نەسیمت هات ئەویشی لێ ستاند
نەشتەری موژگانی تۆ هاتۆتە سەرسەفحەی دڵم
هەر خەتێ بوو غەیری خەتتی سەوزی تۆ پاکی کراند
لەشکری ئاهم لەگەڵ جەیشی حەبەش دەعوا ئەکا
حیرەتم ماوە کە چۆن ئەو دڵبەرە دڵمی ڕفاند؟
بۆ گوڵی ڕووت ماتەمی پەرچەم دەبینێ بۆیە وا
ماهی نەورۆزم بە شیوەن وەک محەڕڕەم خۆی نواند
تۆ لە ئەووەڵ گوێ وەفات هێنایە نێو مەیدانەوە
ئێستە چەوگانی خیلافت، پشتی سەد وەعدەی شکاند
تۆ خودا قەت غیرەتە بۆ تۆ ئەرێ سەروی ڕەوان
گوڵ بەبێ تۆ وا لە باغا خێوەتی خۆی لێ چەقاند؟
باوجود ئینساف بدەم چاکە گوڵیش موشتاقتە

هــەر لــە شــەوقی تۆیــە ســەرپۆش و گریبــانی درانــد
هەرکەســێ مایيــل بــە پیریْکــە و تــەریقیْکی هەیــە
تــۆ بــە شــوعلەی غــەم "حــەریقی" وا وجاخــت هەڵگرانــد

"حەریق" بۆیە چۆتە ئەو باغچەیەوە کە کارەساتی پەڕەی گوڵەکان ببینێ و لەپاشا بۆ پەیکەری پەری ئامێزی بگێڕێتەوە و پێی بڵێ: کە چوومە گوڵشەن گوڵ بە نازێکەوە ڕووی تێکردم، بەڵام من لەبەر ئەوە کە دڵم بۆنی گوڵی ڕووی تۆی گرتبوو لە ترسی ئەوە نەوەك نمەك گیرببم و بێ وەفا دەرچم، قەسەم بە مەرگی تۆ هیچ قسەم لەگەڵ نەکرد، زۆر سەیر بوو، جارێك تۆ ڕێگەت کەوتبووە ئەو گوڵشەنە، تۆزی پێڵاوەکانت نیشتبوونە سەر پەڕەی گوڵەکان، خەریك بوون لەبەر ئەو تۆزە لە خۆیان بایی بن، دەسخۆش، کوتوپڕ سوسەی بای عەترامێزتهات لێی سەندەوەو نەیهێشت ئەوەندە فیز بکەن، بە خەیاڵ نەشتەری برژانگەکانتم هێناوەتە سەر ڕوومەتم بە جۆرێکی وەها کە ڕوو لەسەر ڕوو بن، مەبەستەکەشم ئەوەیە کە ئەو برژانگانە تەنها خەتی سەوزی سمێڵم نەبێ کە تازە دەرهاتووە و لە یادی تۆ، بە بۆنی هەناسەی تۆ ڕواوە هەموو شتێکی تر بکرێنێ و لایبەرێ، ئەمەشم بۆ ئەوە کرد تا تۆ بزانی کوڕێکی شۆخ و شەنگم و تازە کەوتوومەتە مەیدانی پیاوەتی و بە کەڵکی ئەوە دێم کە لام لێ بکەیتەوە، لەشکری ئاهونالەم جمەجمیەتی خەریکە لەگەڵ قۆشەنگی زوڵفی ڕەشدا کە ئەڵێی ئوردوی حەبەشە لە ڕەشی و زۆریدا جەنگ ئەکا، ئێستەش سەرسامم، نازانم خاوەنی ئەو لەشکری زوڵفە، کە دڵبەرمە، چۆن توانی دڵم بفرێنێ بۆ ئەوە کە پەلوپۆم ببڕێ و هیچ ئاهم تێدا نەمێنێ تا بە دەست لەشکری زوڵفەکەیەوە بشکێ؟! من لە سەرەتاوە کە هاتم، بۆ گوڵی ڕوومەتت هاتم کەچی پەرچەمتم چاوپێکەوت مانگی نەورۆزم لێ بوو بە مانگی موحەڕەم،

"حەریق" لێرەدا زۆر ورد ڕۆیشتووە، جارێ مانگی نەورۆز، ئەو مانگەیە کە ئیعتیبار ئـەکرێ لە ۲۱ی شوباتەوە تا ۲۵ی مارت و ڕۆژی ۲۱ی، ڕۆژی نەورۆزە، ئەو مانگە لەبـەر ئـەوە کـە نەورۆزی بە شوێنا دێت و دار و دەوەن و گوڵ و گیا ئەبوژێتەوە مـانگی شـادی و ئاهەنگـە، مانگی مەحەرەمیش ئەو مانگەیە کە ماتەمی کوژرانی حوسێنی تێدا ئـەکرێت و مـانگی گریان و شیوەنە، جا ئەڵێ کە من هاتم، بۆ گوڵی ڕوومەتت هاتم کە گوڵ لە مانگی نەورۆزدا ئەبێ و مانگی شادییە کەچی پەرچەمی ڕەشی پەرش و بڵاوتم چاو پێکەوت مانگی ئاهەنگم لێ بوو بە مانگی ماتەمی، دەستم کرد بە گریان و زاری و شـادیم لێ بوو بە شین، دیسان لـە مانگی نەورۆزدا هەموو دار و دەوەنێك ئەژێتەوە و هەموو چـڵێك لەبـەر ژیانـدنـەوە دڵـۆپ دڵۆپ ئاو لە سەرەکەیەوە ئەتکێن، بەڵکو لەبەر ئەوە کە تۆ پەرچەمی ڕەشـت پۆشـیوە ئـەو دڵۆپە ئاوانە دڵۆپی فرمێسکە و هەڵی دەڕێژن، ئەمانیش بە گریان و زاری وەکو من شادییان لێ بۆتە مانگی موحەڕەم و مانگی ماتەمی... تۆ لە سەرەتاوە وەفات کرد بە گۆیەك و هێناتە مەیدانەوە کەچی ئێستە هەر خۆت بە گۆچانی پەشیمانبوونەوە هەزار تـۆپی وات ڕا فرانـد، ئەرێ هەی باڵابەرزە، ئەوە چۆن ئازاییێکە بۆ تۆ، کە گوڵ لە باخا هەر کە شوێنی تـۆی بـڕی هێنای قیت قیت شا پەڕی خۆی لێ بڵاوکردەوە؟ ئاخر تۆ چـۆن دەبـێ ئەمـە قبـوڵ بکـەیت؟ لەگەڵ ئەمەش من پیاوێکی بە ئینسافم، ئەبێ ئەوەش بزانم و نەیشارمەوە کە، هەر عەشقی ڕووی تۆ بوو کردیەکارێ گوڵی هەزار سنگ و بەرۆکی خۆی دادڕاند و بەربەرەڵایی ریسواکرد، هەر کەسە بۆ خۆی پەروانەی هۆش و فیکر و ڕێگەیەکە، ئای "حەریق" داماوی قوڕ بەسەر، چاك تـووش بوویـت بـە پەروانـەی دەوری غـەم و بـە بڵێسـەی ئاگرینـەوە چـاك وەجاخـت هەڵگراند؟!...

"حەریق" پەردەی غەرامی دائەداتەوە و ئەکەوێتـە کـۆڕی مـەی نۆشـانی تەسـەووف و فەلسەفەی تەسەووفەوە، لێرەدا بە پارێزەوە دەم ئەکاتەوە و ئەڵێ:

ئینکـاری سـیرایەت مەکـە ئـەی مـونکیری مـوفلیس
بـێ سـەیری قەمـەر کـە چ بـە شـۆق و بەزیبایـە
مـونکیر بـە مەسـەل شـەبپەڕە بـێ نـووری هیدایـەت
خـۆی تـالیبی زوڵمـەت بـوو خـودا نـووری نەدایـە
هـەر مەزبەڵـە، هـەر مەشـعەلە جێـی پڕتـەوی شەمـسە
یـەک جێگـەیی فوزڵـە، یـەکێ جێگـەی فـوزە لایـە
نوقـسان لـە تـەرەف قابیلـە، نـەک فـاعیلی کامیـل
ئـەم قـەولی منـە ڕەئیـی جـەمیعی حوکەمایـە
بورهانـە لەسـەر جـەهلی عـەدو "شەمـسی" حەقیقـەت
تـالیع بـووە ئـەو ئەحمەقـە جۆیـایی چـرایە
چـاوی بـە تەمـەع پڕبـووە، قـەلبی بـە حەسـادەت
وەک تـەبعی بـە هـاییم ڕەحـەتی هـەر لەشـەوایە
هێنـدوو نییـە ئـایینی لـە ئاوێنـە تـەعن دا
ئاوێنـە چ سووچـی هەیـە ئـەو ڕوویـی سـییایە؟
پەروانـەیی هـەر جـەمعێ نـەبێ چـاکە "حـەریق"ی
خـۆت باوێـژەرە نـاو زومرەیـی ئـەم "شەمـسی" هەدایـە

لێرەدا باوەڕی "حەریق" لەسەر ئەوەیە کە لە دراوسێتی چاك چاکە وەرئەگرێت و لە هی خراپ خراپە، وە لای وایە نزیکبوونەوە لە بارەگای نووررانی شێخانی رۆحانی نەسیمێکی رزگاربوون لە دەست نەفس و شەیتان دێنێت بە ڕووی ئینسانا، ئەڵێ: تۆ نابێ ئینکاری ئەم مەسەلەیە بکەیت و بڵێیت جا لەم نزیکبوونەوەیەدا چ سودێك وەرئەگرم، ئایا نابینی ئەگەر بە هۆی ئەو دراوسێتییەوە نەبووایە کە لە بەینی مانگ و ڕۆژدا هەیە مانگەکە ئەو شەوق و ڕووناکییەی لە کوێ وەرئەگرت؟ ئەوانەی مونکیری ئەم دراوسێتی وتەنینەوەیەن وەکو شەمشەمەکوێرە وان، شەمشەمەکوێرە لەبەر ئەوەی کە خۆی هەر بۆ تاریکی ئەکوتێ خوا لە ڕووناکی بێ بەشی کردووە ڕووناکی بۆ ئەو وەکو تاریکی بۆ غەیری ئەو وایە، دیسان تەماشا ئەکەی هەموو شوێنێك چ سەرنۆێڵك بێ، چ جێ گوڵستان بێ ڕووناکی ڕۆژ لێی ئەدا، بەڵام یەکێکیان کە سەرنوێڵکەکەیە شوێنی خڵت و خاڵە، ئەوەی تریان کە گوڵستانەکەیە شوێنی عەتر و عەبیرە...

لێرەدا مەبەستی لە شەمس جیناس و تەلیحێك پێکدێنێ کە یوسف شەمسەددینی شێخی بورهانە، ئەڵێ تەئیسیری مەعنەویاتی ئەو ئەکەوێتە سەر هەموو کەسێکی دراوسێ، ئەوەندە هەیە ئەوانەی کە بە ئیخلاس لە سێبەری دراوسێتیەکەیدا نەبن بێ بەش ئەبن لە نەسیمی مەعنەویاتی، هەروەها بارانی ڕەحمەت کە ئەباری ئەدا بەسەر هەموو شوێنێکا، لە هەندێ شوێنا بە هۆی ئەوەوە گوڵ ئەڕوێ، لە هەندێ شوێنا دڕك و داڵ، لە ورد و درشتی هەموو عونسر و ڕەگەزێك تێفکرە، تەماشا ئەکەی هی وا هەیە هەر سەر ئەباتەوە قولاخی خۆی و بۆ ناوەوە ئەچێتەوە، هی واش هەیە مەیلی بەرزی ئەکا و سەرە و ژوور ئەبێتەوە، یەك بنجە گیا لقێکی پان ئەبێتەوە بەسەر زەوییەکەدا، لقێکیشی سەرە و ژوور ڕووە و ئاسمان ئەڕوا، ئەمە دیارە قابیلیەتەکەی وا هەڵ ئەگرێ فاعیلی موختارەکە خوایە، دەخڵێکی بەسەریانەوە نییە، ئەو دوو لقەگیایە کە لە یەك

ساقەتۆو ڕواون و لەسەر یەك بنج دەرهاتوون یەکێکیان مەیلی نزمی ئەکا و ئەویتریان مەیلی بەرزی ئەوە لەبەر ئەوەیە کە لەوە زیاتریان لەبارا نییە بۆیە وا ئەکەن، لێرەدا "حەریق" ڕێگەی عەقایدی ئەهلی ئەشعەری گرتووە، کە ئەڵێن: "خوا شت دروست ئەکا و ئادەمیزاد ئەی هێنێتە دەست".

ئەڵێ ئەم قسەیەش کە ئەیکەم قسەی حوکەماکانە وەنەبێ لە خۆوە پەڕیبێتمە سەری. لەپاشا دێتە سەر ئەوە دەڵێ شوێن سەبەب کەوتن شتێکی ڕواڵەتییە وەنەبێ دۆزینەوەی ئەسڵی حەقیقەت بێ، تەماشا ئەکەی ڕووناکی چرایەك کە دێت و پیاو شوێنێ ئەکەوێ ئەوە وەنەبێ شوێن حەقیقەتەکە کەوتبێ، لێرەشدا فیکری ئەو شیعرەی "نالی کردۆتەوە کە ئەڵێ:

ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر تەقویەتی سەبەب ئەکا
عارفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب ئەکا

جا ئەڵێ ئەو کابرایە شوێن شتی ڕواڵەتی کەوتووە، چونکە چاو و دڵی بە تەماع و حەسودی پڕبۆتەوە و وەکو مالاتی لێ هاتووە، بێجگە لە خواردن و نووستن هیچی تر نازانێ، دیسان ئەڵێ، کابرایێ کە خۆی لە سروشتدا ناشیرین بوو، بۆچی ئەبێ لە ئاوێنە توورە ببێ لە کاتێکا کە سەیری خۆی تیایا ئەکات؟ ئەگەر ئەم خۆی نیشی چاکەی کرد لەپاشا لە ئاوێنەی ئەعمالدا وێنەی چاکە ئەبینێتەوە، ئیتر وەنەبێ بۆ ئەم چاکی و خراپییە سووچێك لە ئاوێنەکەوە ببێ، لەپاشا ئەڵێ: حەریق! خۆت مەکە، بە پەروانەی هەموو چرایەك و لە هەموو شت خۆت هەڵمەقورتێنە، خۆت تەنها باوێژەرە ناو کۆڕی ئەم پیاو چاکانە کە کۆڕی دەستەی شێخی بورهانە.

حەریق لەگەڵ ئەوەش کە خۆی بە پیاوێکی ڕەندوپابەندی تەریقەت هێناوەتە ناوەوە کەچی ویستویەتی دادوزارییەکی بە سۆزیش لە دەست جەوری فەلەك هەڵ ڕێژێ و خۆی بە پیاوێکی ستەم دیدەش بخاتە ڕوو، وەکو لەم شیعرانەیەوە ئەیەوێ ئەوەمان بۆ دەرخا.

هەوری خەفەتە بەفری غەمی داوە بە سەرما
یا سەرِ سەرِی دووریتە کەلێی کردمە سەرما
گاهێ بە شەرارەی غەم و گەه سەرِ سەرِی هیجران
خۆشی نەبوو بۆ من نە بە گەرما، نە بە سەرما
کەوتۆتە سەرم ئەشک و غوباری ئەلەمی دڵ
یەعنی کە قوڕی میحنەتە کردوومە بە سەرما
گەر دەچمەوە "ساحێب" نییە هیچ مونیس و ساحێب
گەر دەچمە "سەقز" ناری سەقەر وا لە جگەرما
شاهیدمە حەواسم کەسەکەم چەندە کەساسم
بە خودا نییە غیرەت لە خەیاڵ و لە نەزەرما
هەرچەندە بە جیسمانی کە دوورم لە حزورت
ڕۆحانییەتت سەبتە لەنێو دیدەیی تەرما
تۆفانی سرشکم چووە سەر "جودی" وجودم
کەشتی تەنی قوم کردو نە نوح و نە ئەسەرما
لەو ساوە کە تۆ ڕۆیی دڵم ڕۆیی بە دوتا

هێلانەیی تەن هەروەکو مەئوایی سەقەرما
بێ فەوجی وەفاکەت کە جەفایە، وەرە ئەمشەو
ئەم لەشکری ئاهی منە بێ فەتح و زەفەرما
لەم قەسوەتەدا تاوەکو کەی پەردەیی زوڵمەت
بەرچاوی دڵم بگرێ؟ دەسا بێ بە گوزەرما
ئاوێنەیی دڵ ژەنگی قەساوەت روخی پۆشی
خاکستەری دڵ سوختەیێ دابێنە بەسەرما
مەڕوانە بەزاهیر کە بەبێ قووتم و رووتم
ڕووتوقووت و خەیاڵت غەزەلی چاکە لەبەرما
سەرمایەتی ئەم ملکی خەیاڵاتە "حەریقی"
حەیفێ کە تەلەف بوو، بەهەدەرچوو، بە زەرەرما

* * *

به ڕاستی "حەریق" لە بابەت جیناس و عیبـارەت ڕەنگینـی و هەڵـسوڕانی وشـەی "سەرما و گەرما" بە چەند مەعنایەك چالاکانە و ئەدەبیانە هاتۆتە مەیدانەوە، ئەمـەی کردووە، دیسان هەر بـەپێی ئـەم شـیعرانەی وا دەرکـەوتووە کـە ویـستویەتی ژیـانێکی خەفەتباری خۆی باس بکات، ئەمەی وتووە گوایا بەو نیـازە کـە لـە هـەموو سوچـێکی خەیاڵبازییەوە خۆی باس بکا، بەڵام من لام وایە کە "حەریق" نـەیتوانیوە لـە مەیـدانی باسکردنی خەفەتبازیدا ئەسپی خۆی تاوبدات.

باشە، ئەو خەفەتی کرد بە هەور و وتمان خەفەت بوو بە هەور، ئایا چۆن غـەم ئـەکا بـە بەفر؟ بەفرێ کە سپییە و غەمێك کە ڕەشە تەشبیە چۆن سـەر ئـەگرێت؟ لـە کوردیـدا لەهەر لایە شتێك شوبهێنرا بە بەفر، ئاشنایەتی لە بەینیانا یا سپیەتییە یا ساردایەتی، لێرەدا ئەو ئاشنایەتییە نییە؟دیسان لە شیعری دووەمدا کە ئەڵێ: "گاهێ بە شەرارەی... هتد" شەرارە کە بۆ ئاگرە، بۆ غەم بەکاری بێنی شوێنی خۆیەتی، چونکە ئاگر ئینـسان ئەسوتێنێ غەمیش ئینسان ئەتوێنێتەوە ئەم ئاشنایەتییە هەیە لە کوردیدا، بـەڵام ئـەم لەپێشا غەمی کرد بە بەفر و ئێستە بە ئاگر، ئەمە لەیەك زۆر دوورن!...

کە وابوو ئەو کەسانە کە ئەڵێن حەریق ژیانی بە خەم و خەفەت ڕابواردووە و ئەم برە شیعرەیان کردووە بە بەڵگەی خەفەتی، دیـارە زۆر چـاك لـە شـیعرەکان وردنەبونەتـەوە، ئەگەر وردببونایەتەوە ئەیانزانی کە حەریق بـە تـەواوی خەفـەت داینەپۆشـیوە، ئەگـەر وابوایە وەکو شتەکانی تری ئەیتوانی تەعبیری لە دڵی خۆی بداتەوە و تووشی ئەم تـەنگ و چەڵمەیە نەهاتایە؟!...

ئەمە قسەیەکی ڕاستە "حەریق" لەبەر پابەندی بە تەسـەووفەوە لەوانـە بـووە کـە بزانێ وا دەمەدەمی ئەوە هاتووە کە کاڵای خۆی لە بازاڕی گێتیـدا بپێـچێتەوە و کۆچـی

دوایی بکات، هێناویەتی بە چەند ڕۆژێك لەپێش ئەم بارکردنەدا بەم شیعرانەی خوارەوەی مالآوایی لێ کردووین:

له خـەرمانی ئەمـەل مێـرووی عەمـەل جـەزبی نـەکرد دانـێ
لـە زەیقــەت خانــەدا ترسـم هەیــە ئــاخر ســەری دانــێ
ئەڵێن جەردەی ئەجـەل ڕێگـا بـە کـاروانی نەفـەس ئـەگرێ
شـــەقامی ســـینە ئــەبڕێ بــۆ مـــەتاعی دیـــدە ئـــەڕوانێ
تەریـدەی نـەفس و شـەیتان قافڵـەی تاعـاتی غـارەت کـرد
ئەگــەر جاسووســـی ئیمـــانی نـــەبێ دەرناچـــی ئینـــسانی
تەرازوی تاعـەتت لەنگـە هـەتا کـەی ئـەم سـەر و ئەوسـەر
بـــە پارســـەنگی حـــەیا دەس هـــەڵبڕە، بنـــوارە میزانـــێ
بەسـی بـێ تاعـەتی رووکـەش مەلـەک سـەرڕافی ئەعمالـە
موجەســـسیل نەقـــدی قـــەڵب و نـــارەوا نـــا باتـــە دیوانـــێ
ئەوا بـەردی ئەجـەل هـات و لـە شیـشەی عـومری دا سـاقی
بـــە قوربـــانی پیباڵـــەی چـــاوەکەت بـــم تێکـــە فینجانـــێ
حـەیات خـۆ چـوو لـەنێو جامـەی حـەیاتی عارییـە بـێ عـار
ئـەوا داوای ئەکـەن چـبکەم "حـەریق" ڕێگـەی ڕەجـا کوانـێ

***

به ڕاستی "حەریق" لەم شیعرانەدا مەردانە هاتۆتە دەست و زۆر بە جوانی مێـرووی کردەوەی لە خەرمانی هیوا بێ بەش کردووە، چەند بە ڕێـك و پێکـی پێـت ئـەڵێ: ئـەوا ڕێگری مردن لە هەورازی سینەوە سەری ڕێی بە نەفەس گرتـووە و تـەنگی بـە گلینــەی چاویش هەڵچنیوە بۆ ئەوە بینایییەکەی لێبسێنێ، ڕاست ئەکا ئەگەر هێزی ئیمان نـەبێ نەفس و شەیتان بە کفرە کونێ هەچ کردەوەیەکی چاکە هەیـە هـەمووی تـالان ئەکـەن، ئۆف! چەند بە کوڵ دەری بڕیوە ئەو فەلسەفەیە کە ئـەڵێ: تـەرازووی عیبـادەت وا سـەر ئەکا، دەسا وەرە پیاوانە بە پارسەنگی شەرم و حەیا ڕاستی کەوە و ئـیتر شـەرم نـەتگرێ باوا نەکا!.. ڕییاکاری پارە ناکـا، چـونکە کـردەوە نـووس فریـشتەیە، ئـەوەی بەکەڵکـە عیبادەت و کردەوەیەکی خاوێن و دوور لە فڕوفێڵە، کە بە ڕووسوری ئەبرێتە مەیدانـەوە، ئەوەی خراپەکەشیە ئەدرێتەوە بەسەرتا، "ماڵی قـەڵب سـەر بـە سـاحێبیە" ئـاخ چـۆن بەردی مردن هات و مینای عومری شکاند؟ دەسا مـەیگێڕی ئـازیز تـا شووشـەکە بـە تەواوی لێك نەبۆتەوە بۆم تێکە پێکێ، لەناو ئـەم جلوبـەرگی خواسـتراوی ژیانـەدا هـیچ ئاگات لێیە چۆن حەیات چوو و بێ شەرم بوویت؟ بەڵێ ئەوا داوای ئەو ژیانـە ئەکەنـەوە ئایا "حەریق" ئاخۆ ڕێی پاڕانەوە لە کوێ بێ، چارەسەرێکت بکەم؟

"حەریق" لەگەڵ ئەوەش کە شاعیرێکی غـەرامی و پاشـا تەسـەووفی بـووە لـە بـازاڕی نوکتەچێتی و جیناسپەروەریشدا چالاکانە هاتۆتە مەیدانەوە: لە تافی خۆیدا داوای گوێ درێژێك لە "مەلا ئەحمەدی لاسور" ئەکا ئەویش بەهانـەی بـۆ دێنێتـەوە و نـای داتـێ، ئەمیش ئەڵێ:

لــە عــوزرا بــوو، مــەلا بۆیــە جــوابی دا وتــی: نــادەم
ولاغ دەس ناکەوێ، عـەیبی نییـە، چـش گـەرمنیش پیـادەم

جنێوێکی ئەدەبیانەی داوە "لـە عوزرابـوو" هـەڵ ئـەگرێ بیـانوی بـۆ هێنابێتـەوە هەڵیش ئەگرێ تڕۆی کردبێ، واتە لە عوزری شەرعیدا بوو، ساچاکی هەر پیادەم، ئـەڵێ

قیروسیا ولاّخ نییە هیچ، بەس نییە پیادە ماومەتەوە و ئەتوانم بە پێی خۆم بـڕۆم، ئـەوەش هەڵ ئەگرێ، ساخۆ ئەو ولاّغەکەی نـەدامێ، کـە وابـوو چـاك وایـە لـە تۆڵـەی ئـەوەدا پیاپاکێشم،!!، لەم شیعرەی دا فیکرێکی تازە و جیناسێکی زۆر جوانی دروستکردووە کـە ئەڵێ:

تــاڵ و شــیرین پێکــەوە نــەم دیــوە چــابێ، چــا، نــەبێ
هــەر کەســێکی هەمنــشینی چــا نــەبێ، پێــت چــا نــەبێ

ئەڵێ نەم دیوە تاڵ و شیرین پێکەوە بگونجێن "چایی" نـەبێ لەگـەڵ شـەکردا، وەیـا چایی نەبێ لەگەڵ جگەرەدا، هەرکەس هاوپیاڵەی "چایی" نەبوو بەلاتـەوە چـاك نـەبێ، ئەوە پیاوێکی باش نییە.

ئەڵێ نەم دیوە تاڵ و شیرین پێکەوە بگونجێن"چایی" نەبوو بێ بەلاتەوە چـاك نـەبێ، ئەوە پیاوێکی باش نییە.

"حەریق" وەکو گوتمان لە سەرەتاوە بە شوێن شیعردا گەڕاوە، بەڵام لە دواییدا والێی ببوو بە خوو، بەبێ خۆ عەزیەتدان کە ئەهات بەسەریا وەکو برێشکە هەڵی ئەڕشت، لـە شیعردا ئارەزووی جیناسی هەبووە لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوان و سادە و مەعناشی بە هێزە، بەم جۆرە توانیویەتی شوێنی خۆی لە ڕیزی شاعیرەکانی پێش ئەم دەورەدا تەرخان بکا و پێش گەلێکیشیان بکەوێ، هەروەها لە عەرەبی و فارسیشدا زۆر بەشدار بووە.

دیوانی شیعرەکەی لەلایەن "کوردی مەریوانی"یەوە لە سـاڵی (١٩٣٨)ی مـیلادی لە چاپخانەی بەغدا بۆ جاری یەکەم لە چاپ دراوە، بۆ جـاری دووەم لـە لایـەن مـەحمود خاکییەوە لە ١٩٦٩ لە چاپخانەی "جەمهوری" لە کەرکوك لە چاپ دراوەتەوە.

***

# حەریق لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردی
# مامۆستا "رەفیق حلمی"دا

"حەریق"مەلا "سالح" کوڕی مەلا نەسروڵلا و خەڵکی گوندی "زیویە"ی ناحیەی سورداشی قەزای سولەیمانیەیە، لە "١٢٨٢"ی هیجری هاتۆتە دنیاوە، بۆ خوێندن زۆر لە کوردستاندا سوڕاوەتەوە، لە ئیلاهیاتدا گەلێك شارەزا و لە زمانی فارسیدا دەستێکی بەتوانای بووە، لەدوای ئیجازە وەرگرتن بەینێك لە وڵاتی سولەیمانیدا ماوەتەوە و لەپاشا چووەتە "سابلاخ" و لەوێ لە حزوری "شێخی بورهانی" خەلیفەی شێخ عوسمانی تەوێڵەدا تۆبەی کردووە و داخڵی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، عومری بە موتاڵاو تەدریس ڕابواردووە، بە سێ زمانی عەرەبی و کوردی و فارسی گەلێك شیعری هەیە کە زۆر بە تەئسیر و بەلیغە، لە "١٣٢٧"ی هیجری دا لە "سابلاخ" کۆچی دوایی کردووە و لە قەبرستانی "مەلا جامی" نێژراوە و دیوانی ئەشعاری هێشتا لە چاپ نەدراوە، ئەم شیعرەهی "حەریقە":

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند
نەک نمەک گیربم بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەم دواند

❊❊❊

جەنابی "ئەمین زەکی بەگ" لە تاریخی سولەیمانی دا تەرجومـەی حـاڵی "حـەریق" بەم ڕەنگە دەنووسێ و ئەم تەرجومەیە کە لە موقەددەمەی دیوانەکەیدا نوسـراوە لەگـەڵ ئەمـەدا فـەرقێکی ئـەوتۆی نییـە، "حـەریق" هـەر شـیعری غـەرامی گوتـووە، بـەڵام شیعرەکانی سەراپا سەنعەتە و لە سەنعەتی شیعریشدا زۆرتر مەیلی جیناس و تەشـبیهو ئیستیعارەی کردووە، هێزی زانایی و مەلایەتی لە شیعرەکانیدا دیارە، وەکو "مەریوانی" ئەڵێ وا دیارە کە هەمیشە دڵ تەنگ و خەفەتبار بووبـێ ئـەو چـەند شـیعرەی خـوارەوە وێنەیەکی ناڵەی دڵی خەمباری حەریقە.

هـــەوری خەفەتـــە بـــەفری غـــەمی داوە بـــە ســـەرما
یـــا ســـەرِ ســـەرِی دووریتـــە کـــەلێی کردمـــە ســـەرما
گاهـــێ بەشـــەرِارەی غـــەم و گەهـــ ســـەرِ ســـەرِی هیجـــران
خۆشـــی نـــەبوو بـــۆ مـــن نـــە بـــە گـــەرما، نـــە بـــە ســـەرما
کەوتۆتـــە ســـەرم ئەشـــک و غوبـــاری ئەلـــەمی دڵ
یـــەعنی کـــە قـــوڕی میحنەتـــە کردوومـــە بـــە ســـەرما
گـــەر دەچـــمەوە "ساحێب" نییـــە هـــیچ مـــونیس و ســـاحێب
گـــەر دەچـــمە "سەقز" نـــاری ســـەقەر وا لـــە جگـــەرما
شـــاهیدمە حەواســـم کەســـەکەم چـــەندە کەساســـم
بـــە خـــودا نییـــە غیـــرەت لـــە خـــەیاڵ و لـــە نـــەزەرما
هەرچـــەندە بـــە جیـــسمانی کـــە دوورم لـــە حـــزورت
ڕۆحانییـــەتت ســـەبتە لـــەنێو دیـــدەیی تـــەڕما

تۆفـــانی سرشــــکم چـــووە ســــەر "جـــودی" وجـــودم
کەشـــتی تـــەنی قـــوم کـــردو نـــە نـــوح و نـــە ئەســـەرما
لـــەو ســـاوە کـــە تـــۆ رویـــی دڵـــم ڕۆیـــی بـــە دوتـــا
هێلانــــەیی تـــــەن هــــەروەکو مــــەئوایی ســــەقەرما
بـــێ فـــەوجی وەفاکـــەت کـــە جەفایـــە، وەرە ئەمـــشەو
ئـــەم لەشـــکری ئـــاهی منـــە بـــێ فـــەتح و زەفـــەرما
لـــەم قەســـوەتەدا تـــاوەکو کـــەی پـــەردەیی زوڵمـــەت
بەرچـــاوی دڵـــم بگـــرێ، دەســـا بـــێ بـــە گوزەرمـــا
ئاوێنــــەیی دڵ ژەنگــــی قەســــاوەت روخـــــی پۆشــــی
خاکــــــستەری دڵ ســــــوختەیێ داپێنـــــە بەســـــــەرما
مەڕوانـــە بـــە زاهیـــر کـــە بـــەبێ قـــووتم و رووتـــم
ڕووتوقووتیـــــو خــــەیاڵت غـــــەزەلی چـــاکە لەبـــــەرما
ســــەرمایەتی ئــــەم ملکــــی خەیالاتــــە "حــــەریقی"
حـــەیفێ کـــە تەلـــەف بـــوو، بەهەدەرچـــوو، بـــە زەرەرمـــا

❊ ❊ ❊

بـــەنی ئـــادەم خـــودا وای کـــردووە ڕۆژێکـــی تامـــاوە
سەراسەر عـومری سـەرفی سـەرف و نـەحوی زەرفـی تامـاوە
مـــەداری تـــوولی ئوميێـــدم خـــەیاڵی گـــەردن و زولفـــە

بــەڵێ سەوداســەری عاشــق لەســەر هەودایــەکی خــاوە
بەســانی پەرچــەمی ئاشــوفتە ســەرگەردان و ژولیــدە
بــە میــسلی زولفــی ســونبول دڵ هەمیــشە حــاڵی شــێواوە
هەوای نافـەی غەزالـەی ڕێـی خوتـەن تووشـی خـەتای کـردم
بــەیادی میــشکی زولفــی ڕووم لــە چــینی پەرچــەمی نــاوە
چــراغی عــومری عاشــق بــای فــەنای هیجرانــی لــێ هــەڵبوو
لـە فانۆسـی ئەدەبـدا حیفزیـی کـە یـەک دوو نەفـەس مـاوە
دەمێکــە چــاوەڕێی ســورمەی غوبــاری مەقــدەمی یــارم
لــەکۆی خوبانــەوە ئیمــڕۆ نەســیم تــۆزێکی هێنــاوە
کتێبــی عیــشقی مــەجنوون ئایــەتی ڕوخــساری لەیلایــە
لــە ســوورەی یوســفا دەرســی جنــوونی ئێمــە نووســراوە
سـەرم کاســی ســەرابی ســوحبەتی کاســەی دڵــی غــەیرە
لــە دەردی دوردی ئــەم جامــە پــەنام بــۆ ســاقی هێنــاوە
کەســێ فیتــرەت بڵنــد بــێ بــۆ ڕەواجــی ســکەیی دینــی
خــەراجی میــسلی قــەلبی خــۆی بــە حوســنی یوســفی داوە
لەســەر ســەودای قومــاری شــاهی خوبــان پیــری بورهــانی
بــە چــەوگانی ئیــرادەت گــۆی ســەرم بــۆ یــاری دانــاوە
نمــای ڕووح و حــەیاتی مــن بــە جیلــوەی ســاقییە بــاقی

نەوەک وەک سپڵە بۆ سفرە لەدووی نان چاوی پڕ ئاوە

بەقوربانت بم ئەی پیری خەراباتی جیهان ئاباد

بەشایەد بە کەمن ڕووحم لە ڕەهنی قوربی تۆ ناوە

شەهی موڵکی یەقین شاهنشەهی هی دین پیری با تەمکین

ڕەئیسی ئەولییا ڕەحمێ، هەتا دڵ ڕێی نەبەسراوە

لە دارول حوزنی میحنەت ناجییە وەک پیری کەنعانی

بەبۆی پیراهەنی یوسف کەسێ چاوی هەڵێناوە

حزووری تۆ بەهەشت ئادەم دڵ و ئەهلی حەسەت شەیتان

بە بۆی دانەی تەماع کێشاویەتە ناو دامی دنیاوە

شەرابی سوحبەتت ئیکسیری خاکی مەعدەنی ڕووحە

لە کارخانەی سەعادەت لوقمەیی لوقمانی هێناوە

عەدو با هەر وەکو عەقرەب بە کلکی نێشی خۆی دەنێ

شوکور تۆزێ حەیای بوو وا بەچاویا دیارە دایناوە

هەتا گوێی پێوە بوو منکیر لە زەلکاوی حەسادەتدا

هەزاری کلکی بگرێ، کەلکی ناگرێ، تازە خنکاوە

وەکو پەروانە بۆ شەمعی جەمالی تۆ ((حەریق)) ئەم شەو

چرای شەوقی بەکبریتی تەبیعەت خۆش هەڵایساوە

لەم شیعرانەی سەرەوەدا شاعیر "خوتەن و خەتا" ولاّتی "چین و ماچین" و تۆزیّ بە مەعنای کەمیّك، وەیا تۆز و غوباریّ هاتووە، دەرد و دورد، کە بە مەعنای خلّتە دیّت و خەراجی میسری و سورەی یوسف و قەندو حوسنی یوسف و لوقمەی لوقمان، کەلّکی ناگریّ و... ئەوانەی هەموو بە وەستایەتیەکی شاعیرانە دامەزراندووە و سەنعەتێکی جوانی ئەدەبی وای تێدا سەرفکردووە کە هەر ئەوانەی شاعیرن و لە سەنعەتی ئەدەب دەتوانن تیّ بگەن بەهای بۆدا دەنێن، بیّجگە لەمانەش کە بە چاوپێداخشاندنێکی کەم بۆ ئەم شاعیرە دەردەکەویّ و دەتوانین بلّیّین کە غەزەلەکانی سەناعەتێکە و وێنەیەکی زۆر شیرین و ڕەنگینی بەلاغەتی کوردییە.

کتێبی عیشقی مەجنون ئایەتی روخساری لەیلایە

لە سورەی یوسفا دەرسی جنونی ئێمە نوسراوە

***

ئەمانە بەلای منەوە گەلێك لە ژوور شیعرەکەی فزولییەوەیە کە دانەری حیکایەتی لەیلی و مەجنونە بە نەزم و یەکێکە لە هەرە شاعیرە بەناوبانگەکانی دەوری پێشووی تورك، کە دەلّیّ:

مجنون ئیلە بەر مەکتەب عیشق ئیچرە ئوقوردق

من مسحەفی خەتم ئیتدم، ئو (واللیل) دەقالدی

که بەم جۆرە کراوەتە کوردی:

من و مەجنون لە مەکتەبخانەیی عیشقا دەرس خوێن بووین
ئەمن خەتمی کەلامم کرد لە (واللیل)ا بەجێما ئەو

فزولی لە شیعرەکەیدا دەڵێ لەگەڵ مەجنون هەردوو لە قوتابخانەیەکی عیشقا دەمان خوێند، من لە قورئان بوومەوە، ئەو هێشتا لە سورەی "واللیل"دا بوو کە مەبەستی ئەمەیە عیشقی لەیل مەجنونی لەسەر وشەی "واللیل" راگرتبوو، نەیدەهێشت لەم وشە بێتەوە تاوەکو ناوی لەیل لە زمانی جیبیا نەبێتەوە، خۆ ئەو بەلاغەتەی کە لەو شیعرانەدایە:

مەداری توولی ئومێدم خەیاڵی گەردن و زوڵفە
بەڵێ، سەوداسەری عاشق لەسەر هەودایەکی خاوە

وا دەزانم ئاتاجی کوتن و گێڕانەوە نییە، "حەریق" لەناو شاعیرەکانی پێش دەوری ئێستادا جێگەیەکی بەرزی هەیە و لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو شیعر و غەزەلەکانی پڕە لە سەنعەت، لەلایەن ڕەوانی و سەلاسەت و بەهێز و پێزی، یانی لە قووەت و مەتانەتەوە وە ژۆور شیعری گەلێکیان کەوتووە، بە تایبەتی لە سەنعەتی مەلایانە زیاتر، کەلە شیعرەکانی "مەحوی"دا یەکجار زۆرە، بە سەنعەتی شاعیران ڕازاوەتەوە.

❊❊❊

## سۆفیەتی لە هۆنراوەی کوردیدا

## عەلائەدین سەجادی

## "حەریق"

بچینە سەروەختی هۆنەری دڵسوتاو بە ئاگری سۆزی سۆفییەتی "حەریق"، بزانین ئەو لەم ڕووەوە جێ دەڵێ:

ئینکــاری سـیرایەت مەکــە ئــەی مــونکیری مــوفلیس
بــێ ســەیری قەمــەر کــە چ بــە شـــۆق و بەزیبایــە
مــونکیر بــە مەســەل شــەبپەڕە بــێ نــووری هیدایــەت
خــۆی تــالیبی زوڵمــەت بــوو خــودا نــووری نەدایــە
هــەر مەزبەڵــە، هــەر مەشــعەلە جێــی پرتــەوی شەمــسە
یــەک جێگــەیی فوزلــە، یــەکێ جێــی فــوزە لایــە
بـــارانی بەڕەحمـــەت لەتـــەرەف مەبـــدەئی فـــەییاز
قــەترێ ئەســەری ســونبول و یــەک چــقڵی گییایــە
تێفکـــرە لـــە ئـــەجزایی عەناســـیر بـــە تەبیعـــەت
یــەک مــاییلی مەرکــەز، یــەکێ ماییــل بــە هەوایــە
نوقــسان لــە تــەرەف قابیلــە، نــەک فــاعیلی کامیــل

ئـــەم قـــەولی منـــە رەئیـــی جـــەمیعی حوکەمایـــە

بورهانـــە لەســـەر جـــەهلی عـــەدو "شەمـــسی" حەقیقـــەت

تـــالیع بـــووە، ئـــەو ئەحمەقـــە جۆیـــایی چـــرایە

چـــاوی بـــە تەمـــەع پڕبـــووە، قـــەلبی بـــە حەســـادەت

وەک تـــەبعی بـــە هـــاییم رەحـــەتی هـــەر لەشـــەوایە

هێنـــدوو نییـــە ئـــایینی لـــە ئاوێنـــە تـــەعن دا

ئاوێنـــە چ سووچـــی هەیـــە ئـــەو ڕوویـــی ســـیایە؟

پەروانـــەیی هـــەر جـــەمعێ نـــەبی چـــاکە "حـــەریق"ی

خـــۆت باوێـــژەرە نـــاو زومرەیـــی ئـــەم "شەمـــسی" هەدایـــە

❊❊❊

حەریق ئەوەی بۆ دەرکەوتووە کە لە دراوسێتی چاکان، چاکە وەردەگرێـت و لـە هـی خراپان خراپە، باوەڕی سۆفیانەی لەسـەر ئەوەیـە کـە نزیکبوونـەوە لـە بارەگـای پیرانـی ڕۆحانی نەسیمێکی ڕزگاربوون لە دەست نەفس و شەیتان دێنێت بە ڕووی ئینسانا، دەڵێ: تۆ نابێ ئینکاری ئەم مەسەلەیە بکەیت و بڵێیت: جـا لـەم نزیکبوونەوەیـە چ ســوودێك وەردەگرم؟

ئایا نابینی ئەگەر بە هۆی ئەو دراوسێتییەوە نەبوایە، کە لە بەینی مـانگ و ڕۆژدا هەیە، مانگەکە ئەو شەوق و ڕووناکییەی لە کوێ وەردەگرت؟

ئەوانـەی مـونکیری ئـەم دراوسـێتی و تەنینەوەیـەن وەکـو شەمـشەمەکوێرە وان، شەمشەمەکوێرە لەبەر ئەوە کە خۆی هەر بۆ تاریکی دەکوتێ، خوا لە ڕووناکی بێ بەشی کردووە، ڕووناکی بۆ ئەو وەکو تاریکی بۆ غەیری ئەو وایە.

دیسان تەماشا دەکەی هەموو شوێنێك، چ سەرەنوێلك بێ، چ جێ گوڵستان بێ ڕووناکی ڕۆژ لێی دەدا، بەڵام یەکێکیان کە سەرەنوێلکەکەیە شوێنی خڵت و خاڵ و پیس و پیسایییە، ئەوەی تریان کە گوڵستانەکەیە جێگای عەتر و عەبیر و بۆن خۆشییە، لێرەدا "حەریق" ئیشارەی بۆ پیرەکەی خۆی کردووەکە "شێخی بورهانە"و ڕووی دڵی لە مەعنەویاتی ئەو کردۆتەوە بارانی بەرەحمەت کە دەبارێ دەدا بەسەر هەموو شوێنێکیا، لە هەندێ شوێنا بەهۆی ئەوەوە گوڵ دەڕوێ، لە هەندێ شوێنا دڕك و داڵ.

لە ورد و درشتی هەموو عونسر و ڕەگەزێك وردبەرەوە تەماشا دەکەی هی وا هەیە هەر سەردەباتەوە قوڵاخی خۆی و بۆ ناوەوە دەچێتەوە، هی واش هەیە مەیلی بەرزی دەکا و سەرەوژوور دەبێتەوە، یەك بنجەگیایە، لقێکی پان دەبێتەوە بەسەر زەوییەکەدا، لقێکیشی سەرەوژوور ڕووەو ئاسمان دەڕوا.

ئەمە دیارە قابیلیەتی وای هەڵدەگرت، ئەگینا فاعیلی کامیل کە خودایە ئیشێکی پێیان نییە، ئەو دوو لقە گیایە کە لە یەك ساقە تۆو ڕواون و لەسەر یەك بنج دەرهاتوون، یەکێکیان بە لای نزمدا دەچێ و ئەویتریان ڕوو لە بەرزی دەکا، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە لەوە زیاتریان لەبارا نییە بۆیە وا دەکەن، لێرەدا "حەریق" ڕێگەی عەقاییدی ئەهلی "ئەشعەری" گرتووە کە دەڵێن: خوا شت دروست دەکا و بەندە دەیهێنێتە دەست، دەڵێ ئەم قسەیەش کە دەیکەم قسەی حوکەماکانە، وەنەبێ لە خۆمەوە بیکەم.

شوێن سەبەب و هۆکەوتن شتێکی ڕواڵەتییە وەنەبێ دۆزینەوەی ئەسڵی حەقیقەت بێ، تەماشا دەکەی ڕووناکی چرایەك کە دێتە پێش و پیاو شوێنی دەکەوێ، ئەو وەنەبێ شوێن حەقیقەتەکە کەوتبێ.

کابرا بۆیە کەوتۆتە شوێن شتێ ڕواڵەتی، چونکە چاو و دڵی بە تەماع و حەسوودی پڕبۆتەوە و وەکو ماڵاتی لێهاتووە بێجگە لە خواردن و نووستن هیچی تر نازانێ.

کابرایەك کە خۆی لە سروشتدا ناشیرین بوو، بۆچی دەبێ لە ئاوێنـە تـوورە ببـێ، لـە کاتێکدا کە سەیری خۆی تێدا دەکا؟ ئەگەر ئـەو خـۆی ئیـشی چـاکەی کـرد لەپاشـا لـە ئاوێنەی ئەعمالدا وێنەی چاکەی بەرچاو دەکەوێ ئیتر وەنـەبێ بـۆ ئـەم چـاکی و خراپییـە سووچێك لە ئاوێنەکەدا هەبێ.

"حەریق" خۆت مەکە بە پەروانەی هەموو چرایەك و لە هەموو شـت خـۆت تێکـەڵاو مەکە، خۆت تەنیا باوێژەرە ناو کۆڕی ئەم پیاوچاکانە کۆڕی دەستەی "شێخی بورهان"

تەماشا دەکەین "حەریق" بە جۆرە باوەڕێکی تردەوە چووەتە ناو فەلسـەفەی سۆفێتیەوە.

"حەریق" مریدی یۆسف شەمسەدین "شێخی بورهان" بووە، فەلسـەفەی سـۆفییەتی لە گۆشەی چاوی ئـەوەوە دەربڕیـووە، لـە بـاوەڕی ئـەوا "شـێخی بورهـان" لـە عالـەمی ((مەعنەویاتا بە جۆرێـك بەرزبۆتـەوە ئەگـەر ئـەو کەسـەی کـە دەیـەوێ لـە ماددیـات دوورکەوێتەوە و بکەوێتە عالەمی مەعنەویاتەوە، ئەگەر ئەو کەسـە بـە ڕێبـازی "شـێخی بورهان"دا نەڕوا، ئەو ئارەزووەی کە هەیەتی بۆی نایەتە ئەنجام و لە غەیری ڕێگاکەی ئـەوا دەستی ناکەوێ..

دیسان ئەم لە ناخی مەعنەویاتا بـە جۆرێـك ڕۆچـووە کـە بـە دەربڕینـی فەلسەفەی سۆفێتی دەیەوێ ئەو مەعنەویاتە وەربگرێ، بە بەڵگە بـۆ مـونکیرانی عالـەمی سـۆفێتی ئیسپانی دەکا کە هەر بوون و نەبوونێك لەم کەونەدا هەیـە هـەمووی پەردەیـە و حـەقایق لەودیوی پەردەکەوەیە، جا ئەوانەی کە ئەو حەقایقـەیان دەوێ دەبـێ چـاویان لـەم پـەردەی ماددیاتەوە نەبێ، چونکە ماددیات و ئەو حەقایقە مەعنەویە گەلێك دوورن لە یەك.

گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد

بەرگی شەشەم، ١٩٧٨

لاپەڕەی ٦٢

# حەریق

## لە دیوانی "پاشەرۆك"ی مامۆستا "هێمن"دا

## وەڵامێکی دۆستانە

دۆستێکی زانا و ورد و خۆشەویستم کارتێکی بۆ ناردووم و نووسیویەتی:
ئەم غەزەلە جوانەی بەم شیعرە تەڕ و ناسکە دەستپێدەکات هی کام شاعیری کوردە؟

هێنـــدە بێــزاری کـــە زانیومـــە بـــەزاری نایـــەوە
دوور لـــە باڵاکـــەت ســـەرینی ناهومێـــدیم نایـــەوە

من هێندە بە هۆش و گۆش نیم هەر شیعرێکی لێم بپرسنەوە بزانم هی کێیە؟ بەڵام بە هەڵکەوت خاوەنی ئەم شیعرە دەناسم و تەنانەت دەزانم بە چ بۆنەیەکەوە گوتراوە، چونکە ڕەنگبێ زۆر کەسی تریش بن نەزانن هی کێیە؟ بەم وتارە جوابی دۆستەکەم دایەوە، تا هەم ئەو وەڵامی خۆی پێ بگا و هەم خوێنەرانیش کەڵکی لێوەربگرن.

ئەم غەزەلە بە هەڵە لە دیوانی "نالی"دا چاپکراوە، بەڵام هی ئەم شاعیرە بەرز و ناسك خەیاڵ و نەمرە نییە، بەڵکو هی شاعیری ڕەنجەڕۆ و چارەڕەش مەلاساڵحی حەریقە، دیارە شاعیری سەر بە نەتەوە بێ بەش و زۆرلێکراوەکان بەختەوەر و کامڕەوا نابن، هیچ شاعیرێکی کورد نا ناسین ژیانێکی خۆش و باشی ڕابواردبێ، بەڵام لە هەموان

چارەڕەشتر، لێ قەوماوتر و هەژارتر "حەریق" بووە، ئەم شاعیرە مەزنە کە ئەگەر دیوانەکەی بە ڕێکوپێکی کۆکرابایەوە، دەمانزانی یەکێك لە شاعیرە هەرە باشەکانی کوردە، ژیانێکی زۆرتاڵ و تفت و پڕ لە کوێرەوەری ڕابواردووە، لە تەواوی ژیانیدا ئاهی خۆشی لە دڵی نەگەڕاوە، لە ساڵەکانی دوایی تەمەنیدا کوێر و کۆڵەوار و گردەنشین بووە و بە دەس تەنگی و هەناسەساردی مردووە، تەنانەت کەم بەختی پاش مردنیش یەخەی بەرنەداوە و بە نەناسراوی ماوەتەوە، بەشی زۆری شیعرەکانی فەوتاون، ئەگەر نەفەوتابن هیچ نەبێ چاپ نەکراون، ئەوەی چاپیش کراون ئاداریان بەسەر پادارەوە نییە.

چەند ساڵ لەوە پێش لاوێکی بەزەوق و شیعر دۆست و زانا بەشی زۆری شیعرەکانی حەریقی کۆکردەوە، دەتوانم بڵێم ڕێکوپێك بوون و یەکێك لە شاگردەکانی هەرە زانای حەریقیش کە هێشتا مابوو یارمەتی دا بوو، منیش تەماشام کرد ولێی ڕازی بووم و حەریقیشم ناسی و پێم وابوو باشترین شاگردی "نالی"یە، وەك بزانم نەیتوانی چاپی بکا، بەڵکو لە نێویش چوو، "حەریق" نەك هەر باشترین شاگردی باشی لەو مەڵبەندەی کوردستان پێ گەیاندوون، "ئەدەب"، "سەیید ڕەشید"، "عەلی بەگی حەیدەری"، "سەیفی قازی" کە خۆی خاوەنی قوتابخانەیەکی شیعرییە، هەموو شاگردی "حەریق" بوون، دەڵێن مشت نموونەی خەرواره ئەوە لە خوارەوە چەن شیعری بە نموونە دێنمەوە، جا دەچمەوە سەرباسەکەی خۆم.

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند
نەک نمەک گیربم، بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەم دواند



ســــتوونی قامـــەتی ڕاگرتـــووە بـــۆ خێـــوەتی دیـــنم
خـــودا بـــۆ تـــوولی عـــومری ئـــەو تـــەناف و دارە نەپـــسێنی

یا:

بەڵەک بوو کێو و سەحرا، وەک دەڵـەک خـۆی دزیـەوە زستان
زەیــستان چــون بــەری خــست ئیتتیفاقــە هێــزی پــێ مابــێ

"حەریق" هەر لە هەرەتی لاوەتی و فەقێیایەتیدا سۆزی سۆفیگەری لە دڵدا هەبووە، کاتێ شاکارە بێ وێنەکەی "نالی" بڵاوبۆتەوە کە دەڵێ:

عیـــشقت کـــە مـــەجازی بـــێ خـــواهیش مەکـــە ئـــیللا کـــچ
شـــیرین کـــچ و لـــەیلا کـــچ و ســـەلما کـــچ عـــەزرا کـــچ
فـــەرقی کـــچ و کـــوڕ ڕەوشـــەن، وەک فـــەرقی مـــەهومیهرە
ئـــەم فـــەرقی شـــەو و ڕۆژە وەک فەرقـــە لـــە کـــوڕ تـــا کـــچ

فەقێ سالْحی لاو جوابی داوەتەوە جـوابێکی وشـکە سـۆفیانە کـە تـەنیا ڕەبـەنێکی دێرنشین دەتوانـێ جوابەجـەنگی ئـەم شـیعرەی "نـالی" بکـا کـە لەسـەر بناغەیـەکی زانستیی ڕەوان شناسی داندراوە و فەلسەفەیکی قووڵی تێدا گونجاوە، جگە لـە هونـەر و سەنعەتی شیعرییەکەی کە گەیاندوویەتە ئەوپەڕی.

من جوابی فەقێ سالح بە درۆ و فریو نازانم، بەڵکە بە ناشیانە و لاوانەی تێدەگەم، مرۆڤ لە سەردەمی لاوێتی و بێ ئەزموونیدا زۆر پابەندی بیروبڕوای خۆیەتی با بیروبڕواکەشی لەگەڵ ئەقڵ و زانست و فەلسەفە زۆر یەك نەگریتەوە، وا دیارە "حەریق" لە کاتی جوابەجەنگی "نالی"دا زۆر لەوە بێ ئەزموونتر بووە و بە تەواوی بڕوای بەم قسانە هەبووە کە کردوونی، بەڵام گوتویانە شانامە ئاخرەکەی خۆشە، ئەو فەقێ ساڵحە بەگژ مامۆستایەکی زانا و خاوەن ئەزموونی وەك "نالی"دا هاتۆتەوە و گوتویەتی:

عیشقت کە حەقیقی بێ، تالیب مەبە ئیللا کوڕ

هەم حەزرەتی لەولا کوڕ، هەم یوسفی والا کوڕ

عیشقێ کە بە قووەت بێ، مایل بە مرووەت بێ

ئەم دیوە کە تالیب بێ، ئیللا کە تەڵەبکا کوڕ

سەد حەیفێ کە تۆ "نالی" بەم پیرییە مندالی

بەم تەرزە لە عیشق ئەدوێیی زیبا کچ و دیبا کوڕ

بەم بیروبڕوای وشکە سۆفیانەوە خوێندنی تەواو کردووە و چۆتە خانەقای "شێخی بورهان"و بۆتە سالێك. سالێك لە خانەقا بەو کەسانەیان دەگوت کە بۆ هەمیشە لە خانەقا دادەنیشتن و خەریکی تاعەت و سلوك کێشان بوون و دەستیان لە دنیا هەڵدەگرت و ژنیان نەدەهێنا و بە ڕەبەنی دەمانەوە، تەنانەت هی واهەبوو کە دەستیان لە ژن و کەسوکاری خۆیان هەڵدەگرت و بۆ هەمیشە یا بۆ ماوەیەکی درێژ لە خانەقا دەمانەوە، بۆ کەسێکی وەك "حەریق" کە تەبیعی ترین هەستی ئیسنانی بە عەیب داناوە و

خۆشەویستی کچی بۆ پیاوێکی وەك ""نالی" بە کاری منداڵانە ئەژماردووە جێگەی لەوەی باشتر کە قەت چاوی بە چاوی کچ نەکەوێ، باشتر چۆن وەگیرکەوتووە؟.
"حەریق" لە خانەقا ماوەتەوە، لەکن شێخ ماقوڵ بووە، خەڵك ڕێزی لێگرتووە، تا بۆتە مامۆستای تایبەتی کورە شێخەکان، بەڵام هەوەسی پیاوانە و تەبعی شاعیرانەی "حەریق" ئوقرەی لێ بڕیوە، نەیتوانیوە وەك "سەیید ڕەشید" و "مام وسین" و "مام جەعفەر" و "یارمەمەد"و "کاکی شفەلی" و "مەحمود دۆشاو"و دەیانی تر تا مردن بەڕەبەنی بژی و بێ ژن و هاوسەر هەڵکا، بە دزی شێخ ژنی هێناوە و ماڵی پێکەوەناوە، دووزمان لە هەموو دەور و زەماناندا هەن، ئەم خەبەرە بە گوێی شێخ گەیشتووە و "حەریقی" لە خانەقا دەرکردووە، سەرەتای چارەڕەشی "حەریق" بە تایبەتی لەباری مادییەوە لێرەوە دەستپێدەکات، لەسەر کچ تووشی کوێرەوەری و دەربەدەری هاتووە، عیشقی مەجازی ئەگەر بۆ هیچ کەس موجازاتی نەبووبێ، بۆ ئەو هەیبووە، لە زمانی خۆی دەگێڕنەوە کە گوتویەتی بۆ پەیداکردنی پارەوە نانێك هەموو شار و گوندەکانی کوردستان گەڕاوم، جا نازانم سەرم بە هەموو ماڵێکدا کردووە یا نا؟
پاش ماوەیەك دەربەدەری، پێشنوێژی مزگەوتی "حاجی حەسەن"یان کە ئەوەدەمی لە قەراغ شاری "سابلاخ" و مزگەوتی هەژاران بووە داوەتێ، مزگەوتی نێوبراو و چ مەلای زانای پێ ڕازی نەبوون، ئێستاش هەر کۆلکە مەلایەکی پێشنوێژی کوێرە دێیەکی بدەنێ، پێشنوێژی ئەم مزگەوتە ناکا.
سەرەڕای ئەم هەموو سووکایەتی پێکردنە "حەریق" هەر سۆفی بووە و عەقیدەی بە شێخی بورهان هەر ماوە و نەگۆڕاوە، بۆیە ئەم غەزەلەی داناوە و بۆ "سەیید ڕەشیدی" دۆستی گیانی بەگیانی و شاگردی خۆی و دەمڕاستی ناردووە، سەید ڕەشیدیش لە

هەلێکی لەباردا بۆ شێخی خوێندۆتەوە.... شێخ بەزەیی بە "حەریق"دا هاتووە و بە خشیویەتی، بەڵام هەرگیز جێی خۆی نەگرتۆتەوە، ئەوەش غەزەلەکەیە.

هێندە بێزاری کە زانیومە بە زاری نایەوە

دوور لە بالاکەت سەرینی نائومێدیم نایەوە

بۆ پیاڵەی مەیلی لەیلا قەلبی مەجنون قابیلە

شۆڕشی شیرین لە ناڵەی کۆهکەن فا مایەوە

حەیفێ هیندەت دەربەدر کرد دڵ لە ئیقلیمی ویسال

شیری منداڵیت بە زەهری هیجرە پێ هێنایەوە

بولبولێکی خۆش نەوا بووم بۆ نەوای دەوری گوڵت

کێ وەکو هود هود حیکایاتی سەبای گێڕایەوە

بۆ کەناری سەوزەیی دەوری، گوڵی رووت شین دەکەم

خاکی کۆی عیشقت بە بێژنگی سەرم بێژایەوە

کەوتە نێو خەرمانی عوەرم ئاگری توولی ئەمەل

سەد کەرەت بارانی وە ـزی لێدرا نەکوژایەوە

تیری موژگان، شیری ئەبرۆ تاق و جوت دەنوێنێ پێم

تا بزانم رۆحی شیرینت چلۆن کێشایەوە

جێی نەزەر بوو حاشییەی زوڵفت لە سەر ئایاتی ڕووت

زۆر موتالام کرد، وەکو دەور و تەسەلسول مایەوە

تــاقی میحرابــی بــرۆت جێــی نــازە بــۆ ئــەهلی نییــاز
سـۆفی وەیزانــی کەچــە، هێنــد کــەر بـو خـۆی گێڕایــەوە
شەمعی خوبـان پڕتـەوێکی "شەمـسی" ڕووی تـۆی لێکـەوت
هێنــد حــەیا و شــەرمی بــە خۆیــدا هــات، بـەجارێ توایــەوە
گـــوڵ بـــژێرێکی زەریفـــم کـــرد لـــەنێو بـــاغی خـــەیاڵ
خۆزگــە مــەردێکی ((ڕەشــید)) بــۆ شــێخی بخوێندایــەوە

هیوادارم دۆستەکەم لێی ڕوون بێتەوە ئەم شیعرە هی حەریقە و بە هەڵە ئاوەکی نێـو دیوانی "نالی" بووە، دیار بوو کەسێکی زۆر شارەزای شیعری "نالی" نـەبێ هەڵەکـە زۆر زەق نایەتە بەرچاو چونکە وەك گوتم "حەریق" شاگردێکی زۆر باشی قوتابخانەی "نـالی" بووە، بەڵام بـە داخـەوە دەبـێ بڵـێم غەڵـەتێکی زۆر گـەورە و دزێـو لـە ئـاخر شـیعری غەزەلەکەدا کراوە، "ئەکل و شۆرییێکی زەریفم کرد لەنێو باخی خەیاڵ" بە ڕاستی دەبـێ پیاو چەند بێ زەوق بێ تا تووشی هەڵەی وا بێ، ئەرێ ئەکل و شوربی نێو بـاخی خـەیاڵ دەبێ چ تامێکی هەبێ؟

جارێك "حەریق" هەجۆی یەکێك لە کوڕەکـانی شـێخ عوسمـانی تەوێڵـەی کـردووە، ئاغایەك بە نێوی "ئیعزامول مولك" لەسەر ئەوە ڕیشی تاشیوە، "حـەریق" شـکایەتی بردۆتە کن "قازی عەلی" مەلای وڵات بەڕابەری قازی خەریك بوون ئاغاکە تەمێ بکەن، لەوکاتەدا کوڕە کوردێك لە دێی "قەباغکەندی" کـچە ئەرمەنییـەکی هـەڵگرتووە کـە باوکی پیاوی ڕووسی تەزاری بووە، ئەم کارە بـچووکە زۆر گـەورە بۆتـەوە و خـەریك بـووە شەڕی عوسمانی و ڕووس و دەوڵەتە مەسیحییەکانی لێ پەیدا ببێ، ساڵی کچی هەرمەنی

مادە تاریخ بوو، مەسەلەکە ئەوەندە گەورە بووە، مەسەلەی"حەریق"لە بیرچۆتەوە، ڕۆژێك کابرایەك لە "حەریق" دەپرسێ: مەسەلەی ڕیشەکەت چی لێ بەسەرهات؟ "حەریق" دەڵێ: با بەڵێ ڕیشی من لە هینەکەی کچە ئەرمەنیدا ون بوو.

من خۆم کچی حەریقم دیبوو کە پیرەژنێکی گۆج و ئیفلیج بوو لەنێو ژنانی "خانەقا" دەژیا و هەموو بەتایبەتی شێخ موحەمەدی کوڕی شێخ و "سەبید ڕەشید" زۆریان ڕێز لێ دەگرت و پێیان دەگوت "دێدە"

****

## حەریق

## لە باخچەی شاعیراندا

## نووسراوی عەبدول عەزیم ماوەتی و عەبدول قادر ساڵح

## حەریق

## ١٨٥١- ١٩٠٧

"حەریق" ناوی ساڵح کوڕی مەلا نەسروڵلای زیوەییە، زیوێ گوندێکە بە شاخی پیرەمەگرونەوە لە لیوای سولەیمانی، باوکی خەڵقی گوندی "کاشتەرە" لە نێوان هەورامانی لوهۆن و جوانڕۆوە، باوکی بە فەقێیەتی لە وڵاتی خۆی دوور ئەکەوێتەوە و لە "زیوێ" ئەگیرسێتەوە و ژن دێنێ، "حەریق" لە ساڵی ١٨٥١ی زایینیدا لە گوندی "زیوێ" هاتۆتە جیهانەوە، لای باوکی سەرەتای خوێندن دەستپێئەکات، لەپاشان ئەچێتە سولەیمانی ، لەوێشەوە بۆ "قەرەداغ و بیارە"، دووبارە ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی لای مەلا ئەورەحمانی پێنجوێنی ماوەیەك دەرس لەو وەرئەگرێ و ئەچێ بۆ "موکریان" ماوەیەکیش بەو ناوەدا بە فەقێیەتی ئەسوڕێتەوە، لەپاشا لە خانەقای "شێخی بورهان" ئەکەوێتە داوی تەریقەتەوە، لەلای "یوسف شەمسەددین" تەریقەت وەرئەگرێ و لە "سابلاخ" ئەبێ بە موددەریسی مزگەوتی" سەیید حەسەن" و هەر لەوێ ژن ئەهێنێ.

بەم جۆرە لەوێ دوا ڕۆژانی ژیانی بە دەرس وتنەوە بە مریدی لە دەوری "شێخی بورهان" ئەباتە سەر، تا لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینیدا لە تەمەنی ٥٦ ساڵیدا کۆچی

دوایی ئەکا و لە گۆڕستانی مەلا جامی لە "سابلاخ" بە خاك ئەسپێرێ، زۆربەی هۆنراوەکانی "حەریق" لە باسی خۆشەویستی و غەزەل و دڵداری دایە بە شێوەیەکی تەڕ و بەتام و بەنرخ، هەروەها لە بارەی کۆمەڵایەتیشەوە هەڵبەستی نایابی هەیە، جارجاریش بەلای فەلسەفەدا ڕۆیشتووە، ئەوەش نموونەی هەڵبەستی:

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند
نەک نمەک گیربم، بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەم دواند
گوڵ بە تۆزی پێتەوە لاف و گەزافی لێ ئەدا
واشکور سۆزەی نەسیمت هات ئەویشی لێ ستاند
نەشتەری موژگانی تۆ هاتۆتە سەرسەفحەی دڵم
هەر خەتێ بوو غەیری خەتتی سەوزی تۆ پاکی کڕاند
لەشکری ئاهم لەگەڵ جەیشی حەبەش دەعوا دەکا
حیرەتم ماوە کە چۆن ئەو دڵبەرە دڵمی ڕفاند؟
بۆ گوڵی ڕووت ماتەمی پەرچەم دەبینی بۆیە وا
ماهی نەورۆزم بە شیوەن وەک موحەڕم خۆی نواند
تۆ لە ئەووەڵ گوێی وەفات هێنایە نێو مەیدانەوە
ئێستە چەوگانی خیلافت، پشتی سەد وەعدەی شکاند
تۆ خودا قەت غیرەتە بۆ تۆ ئەرێ سەروی رەوان
گوڵ بەبێ تۆ وا لە باغا خێوەتی خۆی لێ چەقاند؟

بــا وجــود ئینـــساف بــدەم چــاکە گــوڵیش موشــتاقتە
هــەر لــە شــەوقی تۆیــە ســەرپۆش و گریبــانی دڕانــد
هەرکەســێ مایيــل بــە پیرێکــە و تــەریقێکی هەیــە
تــۆ بــە شــوعلەی غــەم "حــەریقی" وا وەجاخــت هەڵگڕانــد

***

## بەسەرهاتی حەریق

## بە قەڵەمی محەمەد محەمەد ڕەشید

حەریق "ناوی مەلا سالح بووە، لە ساڵی ١٨٥١ ی زایینی دا لە دێی "زێوێ: کە گوندێکە لای "سورداش" لە لیوای سولێمانی و پاڵی داوە بە لای ڕۆژهەڵاتی شاخی "پیرەمەگرون"دوە، لە دایکبووە، باوکی ناوی مەلا نەسروڵڵای بووە، بە فەقێیەتی لە سنووری ئێرانەوە هاتۆتە عێراق و لەپاشا بە مەلایەتی لە دێی "زێوێ" گیرساوەتەوە و ژنی هێناوە: "حەریق" پاش ئەوەی لەلای باوکی سەرەتای خوێندن دەستپێئەکات، ڕێبازی مەلاکانی کوردستان ئەگرێت و بۆ زاخاودانەوەی مێشکی بە سەرف و نەحوی عەرەبی بە فەقێیەتی زۆر جێگای کوردستان ئەگەڕێ، ئەچێتە سولێمانی و لە مزگەوتی شێخ محەمەدی بەرزنجی ئەبێ بە سوختەی فەقێیان، ئینجا ئەچێتە قەرەداخ، لە بیارەش کتێبی "منهاجی نەوەوی" لای شێخ حەیدەر ئەخوێنێ، سەرێکی تر لە سولەیمانی ئەداتەوە، لە ساڵی ١٨٨٤دا لە پێنجوێن لەلای مەلا ئەوڕەحمانی پێنجوێنی کتێبی "گەلەنبەوی

بورهان" که عیلمی مەنتیقە ئەخوێنێ و لەوێوە ئەچێت بۆ موکریان، لای شێخ یوسف شەمسەددین "شێخی بورهانی" کە خەلیفەی شێخ عوسمانی تەوێڵەبووە، تۆبە ئەکا و تەریقەت وەرئەگرێ، لەپاشا لە "سابلاخ" ئەبێ بە مودەریسی مزگەوتی "سەیید حەسەن" و هەر لەوی ژنی هێناوە و کوڕ و کچێکی لێ بووە، ئیتر پاشماوەی ژیانی لە نزیك شێخی بورهان بەسەر ئەبات و تا مردن لەوێ ئەمێنێتەوە.

لە "١٩٠٧"ی زایینی لە تەمەنی :٥٦" ساڵیدا کۆچی دوایی ئەکا و لە گۆڕستانی مەلا جامی لە "سابلاخ" ئەنێژرێ.

## چۆنیەتی ژیانی و خووڕەوشتی

"حەریق" پیاوێکی میانە باڵاو گەنمڕەنگ بووە، چاوەکانی بچووك و بە قولاچوو بوون، ڕوومەتی مەیلە و درێژ بووە، ڕیشی خڕ و بەشی زۆری سپی بووە، مێزەرێکی سپی سابلاخییانەی لە سەر ناوە، زمانی شیرین و لەسەرخۆ قسەی کردووە، بە هەڵبەستە تەڕ و پاراوەکانی·هەموو کۆڕێکی خۆشکردووە بە تایبەتی لەدوا دوای تەمەنی دا کە ئەهات بەسەریا وەکو بەریشکە و بێ ماندوو بوون هەڵبەستی هەڵ ئەڕشت، ژیانی "حەریق" سۆفیانەبووە، نەمر نەژی، زۆر جار بێ شێو سەری ناوەتەوە، بەشی زۆری ژیانی بە دڵتەنگی و خەمباری بردۆتەسەر.

## هەڵبەستی

مەلا ساڵح لە سەرەتاوە سۆزێکی دەوریشی تیابووە، ئەم سۆز و هەستی ناچاری کردووە بە خوێندنەوەی دیوانی شاعیرەکان ، بە تایبەتی "مەولەوی" و "نالی" لە چاخی ناوەڕاستی فەقێیەتی دا کەوتۆتە گڕ و گاڵ، "حەریق"ی کردووە بە نازناوی هەڵبەستی، لە سەرەتادا زۆر ماندوو بووە بە هەڵبەست و وتنەوە و بەگران بۆی هاتووە، بەلام لە دواییدا کە ئیلهامی هەڵبەستی خۆی ئەدۆزێتەوە کە "شێخی بورهانە" سەرچاوەی هەڵبەستی وەکو کانیاوی بەهار هەڵ ئەقوڵێ، سۆزی عەشقی شەمسەددین وای لێ ئەکات کە بە هەڵبەست لەگەڵ خەڵکا بدوێ.

بە سێ زمان هەڵبەستی وتووە، بە کوردی و فارسی و عەرەبی، وە لە کوردیدا توانیویەتی بە شێوەی هەورامیش هەڵبەست بڵێ، لە زمانی فارسی دا پرۆفیسۆرێك بووە بۆ خۆی.

**هەڵبەستەکانی ئاوێنەیەکن، چۆنیەتی ژیانمان پێشان ئەدا لەو سەردەمەدا.**

زۆر حەزی بە جیناس و ڕستە و وشە ڕەنگینی کردووە، کاتێ کە لە مەیدانی هەڵبەست وتنا بڕوای بە خۆی پەیداکردووە و هەستی کردووە کە هەڵبەستەکانی بایەخێکیان هەیە، ئیجگار بە شانازییەوە وتویەتی:

بێرە مەیدانی فەساحەت ئەسپی خۆت لینگ دە "حەریق"

تا بزانم کێ بە شیعرت سوحبەت و یاری ئەکا.

ئەم بڕوا بەخۆپەیداکردنە وای لێ کردووە کە لەگەڵ شاعیرەکانی تردا بکەوێتە شەڕە هەڵبەست و بەرپەرچدانەوەیان، ئەبینین بە هەڵبەستێکی دوور و درێژ ڕووبەڕووی **"نالی"** ئەوەستێ و پێی دەڵێ:

سەدحەیفێ کە تۆ نالی بەوپیرییە مندالی
بەم تەرزە لە عیشق ئەدوێی زیبا کچ و دیبا کوڕ

ئەمەی بەرامبەر بەو برە هەڵبەستەی **"نالی"** وتووە کە بەسەر کچا هەڵی داوە و سەرەتاکەی دەڵێ:

عیشقت کە مەجازی بێ خواهیش مەکە ئیللا کچ
شیرین کچ و لەیلا کچ، سەلما کچ و عەزرا کچ

شانی لە شانی مەولەویش داوە، کە چۆن مەولەوی پەروانەی شێخ عوسمانی سیراجەدین بووە و بە برە هەڵبەستەکەی کە بە:

شێخی دەوڵەمەند بەهرەی سەرمەدی
یا گەی حەقیقەت جیلوەی ئەحمەدی

سەرەتاکەی ئەکاتەوە و سۆزی خۆی بەرامبەر شێخی خۆی دەربڕیوە، ئەمیش بووە بە پەپوولەی شێخ یۆسف شەمسەددین و بەو بڕە هەڵبەستە شێوە هەورامییەکەی کە سەرەتای ئەکاتەوە بە:

چ سوب سەحەردا دیم غونجە دەمێ

نەپەردەی عیسمەت نما نا چەمێ

وە خۆشەویستی خۆی بەرامبەر بە شێخی خۆی دەرنەبڕێ، "حەریق" وەکو لە هەڵبەستەکەیا دەڵێ، توانیویەتی لە زۆر لە مەیدانەکانی هەڵبەستدا ئەسپی خۆی لینگدا، دەبینین وەکو زۆر شاعیرەکانی تر دێتە مەیدانی غەرامییەوە و بە وشەی جوان و ڕەنگین، هەست و سۆزی بەرامبەر دڵدارەکەی ڕوون ئەکاتەوە و پەیمانپەروەری خۆی پێ ئەسەلمێنی، جارێکی تر ئەبینین پەردەی غەرامی دائەداتەوە و ئەکەوێتە کۆڕی مەی نۆشانی تەسەوف و فەلسەفەی تەسەووفەوە و پیتۆلی خۆی لە تیولۆژیدا نیشان ئەدات.
یا ئەبینین لەگەڵ ئەوەشا کە خۆی بە پیاوێکی ڕەند و پابەندی تەریقەت هێناوەتە ناوەوە، کەچی ویستویەتی داد و زارییەکی بە سۆزیش لە دەست جەوری ڕۆژگار هەڵڕێژێ و خۆی بە پیاوێکی ستەم دیدە بخاتە ڕوو.

"حەریق" لەگەڵ ئەوشا کە شاعیرێکی غەرامی و لەپاشا تەسەووفی بووە لە بازاڕی نوکتەچینی و جیناسپەروەریشدا چالاکانە هاتۆتە مەیدانەوە. لە تافی خۆیدا داوای گوێدرێژێك لە "مەلا ئەحمەدی لاسوور" ئەکا، ئەویش بە هانەی بۆ دێنێتەوە و نایداتێ، ئەمیش دەڵێ:

لــە عــوزرا بــوو مــەلا بۆیــە جــووابی دا کــوتی نــادەم
وڵاخ دەس ناکەوێ عـەیبی نییـە چش گـەر منیش پیـادەم

بەم دێڕە هەڵبەستەی جنێوێکی ئەدیبانەی پێ داوە، لـە عـوزرا بـوو هـەڵ ئـەگرێ بیانووی بۆ هێنابێتەوە، هەڵیش ئەگرێ ترۆی کردبێ، واتە لـە عـوزری شـەرعیدا بـوو، ئینجا دەڵێ: قیروسیا وڵاخ نییە بەس نییە پیادە مـاومـەتەوە ئەتوانم بە پێـی خـۆم بـڕۆم؟ ئەوەش ئەگرێتەوە: ساخۆ وڵاخەکەی نەدامێ، کـەوا بـوو چـاك وایـە لـە تۆڵـەی ئـەوەدا پیایاکێشم..
لەم هەڵبەستەیدا بیرێکی تازە و جیناسێکی زۆر جوانی پێکهێناوە دەڵێ:

تــاڵ و شــیرین پێکــەوە نــەم دیــوە چــابێ، چـا نــەبێ
هــەر کەسـێکی هــەم نـشینی چـا نــەبێ، پێـت چـا نــەبێ

دەڵێ نەم دیوە تاڵ و شیرین پێکەوە بگونجێن "چایی" نەبێ لەگەڵ قەنددا، هەرکەس هاوپیاڵەی چایی نەبوو بەلاتەوە چاك نەبێ، ئەوە پیاوێکی باش نییە.
لەپێش مردنیدا بە ماوەیەکی کەم ئەم هەڵبەستە ڕێك ئەخات کە وەکو ئیلهام وایـە بـە نزیکبوونەوەی مردنی:

لە خەرمانی ئەمەل مێرووی عەمەل جەزبی نەکرد دانێ
لە زەیقەت خانەدا ترسم هەیە ئاخر سەری دانێ
دەڵێن جەردەی ئەجەل ڕێگا بە کاروانی نەفەس دەگرێ
شەقامی سینە دەبڕێ بۆ مەتاعی دیدە دەڕوانێ

لە هەڵبەستدا ئارەزووی جیناسی هەبووە، لەگەڵ ئەوەشا ڕەوان و سادە و ماناشی بەهێزە، بەم جۆرە توانیویەتی شوێنی خۆی لە ڕیزی شاعیرەکانی پێش ئەم چەرخەدا تەرخان بکا و پێش گەلێکیشیان بکەوێ و چەپکە گوڵی هەمە ڕەنگەی بۆنداری خۆی پێشکەش بە گوڵدانی وێژەی کوردی بکات.

****

# حەریق
# لە "ژیناوەری زانایانی کورد"دا
# ١٨٥١- ١٩٠٧زایینی

گوڵی نەژاکاوی نەناسراوی وێژاوەران، سووتاوی باڵای بەژن زراوان، گوڵی نێو گوڵاڵان لە مانگی گوڵان، زمان تەڕ و پاراوی پەروەران، سۆفی شێخی سەر بەرماڵان لە پەروەراندانی واتا، واتای زۆر بە تام و پڕ واتایە، دڵ و دەروونی تەژییە لە قسە و واتا، سینەی ئەنجن ئەنجن و بریانە لە دەس جەوری زەمانە، بەڵام شیعری "حەریق" بۆ دڵ برینداران خۆی باشترین دەرمانە، هۆنەر و خودان هونەرە.

دڵ و دەروون سووتاوی ئەم جارەمان ناوی "سالح" و کوڕی مەلا نەسروڵڵای "زێوێ"یە کە٬گوندێکە سەر بە "سورداش" لە ئوستانی سولەیمانی، پاڵی داوە بە لای خۆرهەڵاتی چیای "پیرەمەگرونەوە"، مەلا نەسروڵڵای باوکی لە ئاوایی "کاشتەر" لە دایکبووە، لۆن وکاشتەر دوو گوندن لە داوێنەی "شاهۆ"ان، کەوتوونەتە هەورامانی لهۆن و جوانڕۆوە، لای باشوورەوە ئەلکێ بە ماهی دەشتەوە ، مامۆستا عەلائەدین سەجادی زانای ناوداری کورد لە پەڕاوی مێژووی ئەدەبی کوردیدا نووسویەتی: مەلا نەسروڵلا بە فەقێیەتی بۆ بەدەسهێنانی عیلم و زانست بە کوردستانا بەم فێرگە بۆ ئەو فێرگە و بۆ فێربوون ئەگەڕێ و ئاوارەی گوند و شاران و هەندەران ئەبێ، لە پاشان بە مەلایەتی لە گوندی "زێوێ" دەگیرسێتەوە و ژن دێنێت.

بولبولی گولزاری گوڵی وێژە و وێژەرانی ناو کوردەواری "سالح حەریق" لەساڵی ١٨٥١ی زایینی لە گوندی "زێوێ" لە دایکبووە، سەرەتا کتێبە وردیلەکان لای مەلا نەسروڵڵا ئەخوێنێ، دوای ماوەیەك ئەچێتە شاری سولەیمانی و لە فێرگەی شێخ محەمەد بەرزنجی ئەبێتە سوختەی ناو فەقێکان و چووەتە قەرەداغیش، لە بیارە مەبەستی "نیکاح" لە پەراوی "مینهاج"ی "نەوەوی" لای "شێخ حەیدەر" ئەخوێنێ، جارێ تریش ئەگەڕێتەوە شاری سولەیمانی ، "حەریق" لە ساڵی ١٨٨٤ی زایینی لە شارە خونجیلانەکەی "پێنجوێن" بورهانی گولنەبەوی "لە زانستی مەنتیقدا لە فێرگەی مەلا ئەورەحمانی پێنجوێنی ئەو زانا گەورە ئەخوێنێ و لەوێوە ئەچێ بۆ موکریان، پاش ماوەیەك ئەچێتە خانەقای بورهان و لەسەر دەستی شێخ یۆسف شەمسەددین "شێخی بورهان" تەریقەت وەر ئەگرێ و ئەوسا ئەچێتە "سابلاغ" "مهاباد"و ئەبێتە مودەریسی فێرگەی مزگەوتی "سەیید حەسەن"و لە شاری مهاباد ژن دێنێ، خوا کچێکی پێ دەدا، "حەریق" لە تەمەنی ٥٦ ساڵیدا لە ساڵی "١٩٠٧"ی زایینی بەرەو لای خوا بارگەی تێکناوە و لە گۆرستانی زانای ناودار "مەلا جامی" نێژراوە. "حەریق" زۆر ئۆگری خوێندنەوەی شیعر و دیوانی "مەولەوی" و "نالی" بووە و ئەم دوو زانایە زۆریان شوێن لەسەر "حەریق" داناوە، "حەریق" لەبەر سۆزی دڵی سووتاوی "حەریق"ی بۆ نازناوی خۆی داناوە، زۆری حەز لە جیناس و بێژەی ڕەنگین کردووە و ویستویەتی شیعرەکانی کۆلکە زێڕینە بن و جارجاریش زۆر شانازی بە شیعری خۆی کردووە، هەر وەکو فەرموویەتی:

بێرە مەیدانی فەساحەت ئەسپی خۆت لینگ دە "حەریق"

تا بزانم کێ بە شیعرت سوحبەت و یاری ئەکا؟

جار جاریش بە گژ "نالی"دا هاتووە و فەرمویەتی:

سـەد حـەیفێ کـە تـۆ نـالی بـەم پیرییـە منـداڵی
بـەم تـەرزە لـە عیـشق ئـەدوێی زیبـا کـچ و دیبـا کـوڕ

حەریق شانی لە شانی مەولەوی داوە:

شـێخی دەوڵەمەنـد بـەهرەی سـەرمەدی
یـا گـەی حەقیقـەت جلـوەی ئەحمـەدی

حەریقیش فەرمووێەتی:

چ سـوب سـەحەردا دیـم غونجـە دەمـێ
نـە پـەردەی عیـسمەت نمـا نـا چـەمێ

ئەمەش "گوڵشەنی حەریق"

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵـشەن گـوڵ بـە عیـشوە خـۆی نوواند
نەک نمەک گیربم بـە مـەرگی تـۆ قـسەم هـیچ نـەم دوواند

د. محەمەد صاڵح ئیبراهیمی محەمەدی (شەپۆل) ژینارەوی زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامەتی، یا گەنجینەی فەرهەنگ و زانست لاپەڕەی ٧٨٨تا ٧٩٥- چاپی گولاتی هەزار و سێسەد و شەست و چوار، چاپخانەی مەهارەت لە تاران.

# حەریق

## لە "گۆواری بەیان"دا

## "ئەدەب و تەسەووف"

تەسەووف وەکو پاپۆڕێکە بە دەریای شەریعەتی ئیسلامەتی دا ئەڕوا و لەم بەرەوە مرۆڤ ئەپەڕێنێتەوە ئەوبەر، شاعیرە کوردە کلاسیکییەکان هەرکات نەیانتوانیوە بەبێ تەریقەت بژین، هەمیش حەزیان بەسەر گەرمی مەعنەوی و مەستی دەروونی و حاڵەتی جونبوش و جەزبە کردووە و هەمیشە خۆیان کردووە بە خزمەتکار و بەندە و غولامی پیری تەریقەتەکەیان، زانایەك و شاعیرێکی وەك مەولەوی بووە بە پەروانەی شێخی سیراجەدینی یەکەم.

"حەریق" مەلا سالحی زێویی" ۱۸۵۱-۱۹۷۵"ی زایینی ئەگەر دەستکەوتێکی رۆحی و مەعنەوی نەبووبێ و لە مەیخانەی مەیفرۆشان و بادەنۆشانی دەرگای ئەحەدییەتدا سەرمەست نەبووبێ، نە ئەبوو بە پەروانەی شێخ یۆسف شەمسەددین کە خەلیفەی شێخ عوسمان بووە کە وەکو کانیاوی بەهار هەڵقوڵاوە هەروەك ئەڵێت:

عیشقت کە حەقیقی بێ تالب مەبە ئیللا کور

هەم حەزرەتی لەولا کور هەم یۆسفی وا لا کور

هەر عیشقێ حەقیقی بێ، وەک عیشقی حەریق ی بێ

مەیلی بە دەقیقی بێ، بۆ مەعریفە توللا کور

ژمارەی ٥١ تەشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۷۸

لاپەڕەی ۲۲- جەماڵ موحەمەد

## حەریق و گۆواری کاروان

هۆنەر و نووسەری پایەبەرز و بەهرەمەندی کورد مامۆستا کاکەی فەللاح لە گۆواری کاروان ژمارە (٤٠)ی مانگی دووهەمی ١٩٨٦ سالّی چوارەم نووسراوە و مەبەستێکی بلاوکردۆتەوە لەژێر سەردێری "چەند شیعرێکی بلاونەکراوەی ناری"و لەم نووسراوەدا یەکێك لە غەزەلەکانی حەریقی بە ناوی هۆنەری زانا و بەهرەمەندی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا کاکە حەمەی "ناری"یەوە بلاوکردۆتەوەو ڕایگەیاندووە کە مامۆستا مەلا کاکە حەمە ئەم غەزەلەی بۆ تایەر بەگی وەسمان پاشا وتووە.

سەردێر و دوایین دێڕی غەزەلەکەش لە نووسراوەکەی مامۆستا کاکەی فەللاح دا بەم جۆرەیە:

حوزنی من یا حوسنی تۆ ئیشکا لە تا ئاخر نەفەس

چۆن زەکاتی حوسنی تۆ یا حوزنی من ناگا بە کەس

خالّی سەوزە، داخی سەوزە، بەحسی ناسۆری مەکەن

تازەدەی تۆ بێ کە "ناری" قەت شیفای نایە بە کەس

بەلاّم لە ڕاستیدا ئەوەی شایانی باس بێ ئەوەیە کە ئەم هۆنراوەیە یەکێك لە غەزەلە هەرە بەرز و جوانەکانی مەلا سالّحی حەریقەوە لە زۆربەی کەشکۆلّ و دەستنووس و بەیازەکاندا و تەنانەت لە دەستنووسە بە ناوبانگەکەی "میرزا عەبدوللاّی شا بەندەریش"دا هەر بە ناوی حەریقەوە نووسراوە و تۆمارکراوە.

جگە لەوەش "حەریق" لە هۆنینەوەی هەڵبەست و غەزەلدا شێوە و شێوازێکی تایبەت بە خۆی هەیە و ئەم غەزەلەش لەباری مەبەست و مەعنا و لێکچوون و وردەکاری و جوانکاری و خۆشخوانیشەوە هەر لە غەزەل و هۆنراوەکانی "حەریق" دەچێت و هیچ گومانێکی لێ ناکرێت. هەر وەکو ئەم هۆنەرە بەهرەمەند و کارامەیە لە دوایین دێڕی غەزەلەکەدا نازناوی خۆی زۆر شاعیرانە و شارەزایانە هێناوە و گوتویەتی:

حوزنی مـن یـا حوسـنی تـۆ ئیـشکا لـە تـا ئـاخر نەفـەس
چـۆن زەکـاتی حوسـنی تـۆ یـا حـوزنی مـن ناگـا بـە کـەس
خـاڵی سـەوزە، داخـی سـەوزە، بەحـسی ناسـۆری مەکـەن
تـازەدەی ئـەو بـێ "حـەریقی" قـەت شـیفای نایـە بـە کـەس



# حەریق

## لە گوواری "سروە"دا

## نوسراوی مامۆستا: "هێمن"

"حەریق" ئەو شاعیرە مەزنەیە کە مەکتەبی شیعری"نالی" هێنا موکریان و لەو مەڵبەندە هەر کەس شیعری کوردی گوتووە، یا دەڵێ، بۆ ئەم لاوئەولا لەوی فێربووە، نەکەم؟ تا ئێستا چی وی نووسراوە و گوتراوە بە کەڵك نەبێ؟ من بۆ خۆم لەسەر ئەو شاعیرە گەورەی کە غەزەلی وەك:

هێنـــــدە بێـــــزاری کـــــە زانیومـــــە بـــــە زاری نایـــــەوە
دوور لـــــە بالاکـــــەت ســـــەرینی نائومێـــــدیم نایـــــەوە

★ ★ ★

چاوەکەم ئەمرۆ لە گوڵـشەن گـوڵ بـە عیـشوە خـۆی نووانـد
نەک نمەک گیرم، بە مـەرگی تـۆ قەسـەم هـیچ نـەم دووانـد

چیم گوتووە، هەر ئەوەندە دەزانم، ناوی مەلا ساڵح بووە، نزیکەی چەرخێك لەوەی پێش لەودیورا هاتۆتە ئەم دیوە و لە خانەقای "لوساوکان" یا خانەقای شێخی بورهان گیرسایەتەوە و زۆری عاقیدە بە شێخ بووە.

نازانم له کوێ بەڵام لەسەر شیعرێك "ئیعزامول موڵك" فینوداڵی مەشـهور ڕیـشی لوس تاشیوە، ئەوە بۆتە هۆی ئەوە بێتە "سابلاغ"و ببێتە مەلای مزگەوتی حاجی سەیید حەسەنی خزمی خۆم، ئەو کەسانەی چل پەنجا ساڵ لـەوەی پـێش چـاویان بـەو مزگەوتـە کەوتبێ، دەگەڵ من ئەگەر بڵێم برسیایەتی و هەژاری و ناچاری نـەبوو بـا هـیچ کۆلکـە مەلایەکیش بە پێشنوێژی ئەم مزگەوتـە ڕازی نـەدەبوو، ڕەنگبـێ پـێش سـاڵی ۱۳۲۸ی کۆچی کە ساڵی وەفاتی شێخە، مردبێ و لە گۆڕستانی "مەلا جامی" نێژراوە هەر خـوا دەزانێ ئێستا گۆڕەکەی بناغەی خانووی کام موسڵمان بێ، خوا بکەم لای سەرووی هاڵ یا میوانخانەی بێ و نەکرابێتە حەمام و شتی وا.

## حەریق و بۆنەی شیعرەکان

حەریق وەکو شاعیرێکی نێو بە دەرەوە و ناسراوی کورد بۆ گەلێ مـناسـەبەت واتـە بـە بۆنەی گەلێ شتەوە شیعری گوتووە و ئەوەی لە دیوانەکەی دا تـا ڕادەیـەك سەرنجڕاکێـشە ئەوەیە بۆنە و هۆی گوتنی بەشێك لە هۆنراوەکانی دەزانرێ، وا لە خوارەوە چەند وێنەیەك لەو هۆنراوانەی کە لە کاتی خۆیدا گوتویەتی پێشکەشتانی دەکەین.

میرزا لەتیفی قازی کوڕی میرزا ئەحمەدی کوڕی میرزا مەحمودی کوڕی خوالێخۆشبوو قازی لەتیفی مەهابادی کە پیاوێکی زۆر زانا و زیرەك و بە هۆش بووە لە دێـی "گـردی یاقوب"ی ناوچەی شاروێرانی مەهاباد قازی شەرع بووە، ئەم غەزەلـە پـڕ لـە هەسـت و سۆزەی بۆ مەلا ساڵی "حەریق" نووسیوە و بۆی نـاردووە، بـۆ ئـەوەی پێکـەوە بـچن بـۆ زیارەتی شێخی بورهان.

ماهـــێ تەمامـــە مـــاهی تـــەمامم نـــەدیوە مـــن

ئێـــستا تەمامـــە، حـــەیفێ کـــە جێگـــام نـــەدیوە مـــن

بـــــۆ ڕۆژی عـــــاریزی ڕۆژت گـــــەلێ گـــــەڕام

شەمـــسی جیهـــان بـــە تەلعـــەتی تـــۆم نـــەدیوە مـــن

گەرچـــی خەزانـــە بـــۆ وەرەقـــی سـەبزی سـەر ڕەزان

زانـــیم کـــە حـــوجرە سـاردە تفـــاقم کڕیـــوە مـــن

حەریقیش بە هۆنینەوەی غەزەلێکی ئاگراوی و حەریقانە هەر لەسەر ئەم شێوە و شێوازە وەڵامی میرزا لەتیفی داوەتەوە و غەزەلەکەی ئەوەندە بە سۆز و کاریگەرەوە، تین و تەوژم بەزەوق و خەیاڵدا دێنێت.

لـــەو وەختـــەوە لـــە خزمـــەتی تـــۆ پـــێم بڕیـــوە مـــن

وەک میهـــری تـــۆ بەشاشـــەتی ڕەنگـــم پـــەڕیوە مـــن

فەســـڵی خەزانـــە، وەقتـــی خزانـــە لەســـەر ڕەزان

ســـەرمایی ســـەردمیهریی یـــارم چەشـــیوە مـــن

هـــەر وەک بـــرۆی هیلالـــی لەبـــەر جـــەوری پەرچـــەمی

چـــاوی دەزانـــێ شـــاهیدە قـــەددم چـــەمیوە مـــن

لـــە علـــی یـــەمان و حوققـــەیی مـــەرجانی باعیـــسە

ئەشـــکی لوئـــالی مـــەردومی دیـــدەم چـــەکیوە مـــن

خـــالّی نییـــه دەمێکـــی خـــەیالّم لـــە خـــەیالّی وی

مـــەنعم مەکـــە پـــەردەیی عـــارم دڕیـــوە مـــن

مـن پـڕ دەکـەم تـەنووری مەحەببـەت لـە نـاری شـەوق

تـــۆش ئاشـــی لـــێ بنـــێ کـــە دڵـــم دەرپـــەڕیوە مـــن

فـەرمو وەرە کـە فەرشـی غـەزەل ڕادەخـەم لـە ڕێـت

جـــەرگ و دڵـــم بـــە نـــاری مەحەببـــەت کوڵیـــوە مـــن



لە ساڵی ١٢٩٦ کۆچی مانگی کە حەزرەتی شێخ لـە سـەفەری حـەج دەگەڕێتـەوە حەریق بە بۆنەی هاتنـەوە و گەڕانـەوەی ئـەم پـیرە ڕوونـاك دڵەکـە سـەفەرەکەی مـاوەی سـاڵێکی خایاندووە غەزەلێکی زۆر ناسك و بە سۆز و جوانی هۆنیوەتەوە کـە ئـەوا چـەند شیعرێکیٛ لیٛ دەنووسین.

مـوژدە بـێ بـۆ بولبـولی دڵ گـوڵ لـە باغـان هاتـەوە

قومری عومری خـۆی سـەرف کـا سـەروی بۆسـتان هاتـەوە

شاســـواری عەرســـەیی مەیـــدانی مـــەردان هاتـــەوە

دڵبـــەری جانـــان لـــە خزمـــەت جـــانی جانـــان هاتـــەوە

پیـــری ڕەوشـــەن دڵ وەکـــو خورشـــیدی تابـــان هاتـــەوە

نـــاییبی عوســـمانی ســـانی خـــۆش بـــە ســـامان هاتـــەوە

حەریق ئەم چامەشی لە دوایین ساڵەکانی ژیانی دا کە بە هۆی نەخۆشی و ناسازییەوە لە جێگەدا کەوتووە، بۆ خوا لێخۆشبوو سەیید ڕەشید نووسیوە کە ئەوا چەند شیعرێکی لێدەنووسین:

ئەی جەنابی سەییدی عالی نەسەب کەی ڕەهەرەوێ
عەزرە و دەردی دەوام و بێ دەوام دینێتە وێ
بۆ خەروری پیری کامیل عاریفی دانایی ڕاز
شەمسی ئەفلاکی هیدایەت نەجمی ڕێی هەر شەبرەوێ
خۆ موسەللەم گەر لە غاییب دەستی پیر کوتانییە
کەی دەبێ دەست و دڵی پیری لە بۆ من ڕێ کەوێ

حەریق جگە لەو هەموو گیروگرفتانەی کە تووشیان بووە لە دوایین ساڵەکانی ژیانیدا چاوەکانی خۆی لەدەستداوە و ئەم دەردەش بووە بە سەرباری هەموو دەردەکانی تری، ئەم ڕووداوە ناخۆش و دڵتەزێنە ڕۆچنەی هیوا و ئاواتی بەیەکجاری لە ڕووبەستووە و تووشی خەم و خەفەتێکی زۆری کردووە، لە نامەیەکدا کە بۆ سەیید ڕەشیدی دەنووسێت سکاڵا لە ژیانی ناخۆش و پڕ لە ڕەنج و ئازار و ئیشارە بۆ کوێربوونی چاوەکانی خۆی دەکا و دەڵێ:

ڕۆژ و شەو غەرقی خەیاڵم بێ ئەنیس و بێ نەدیم
چاو نەما تا بڵێم قەت خەو لە چاوم ناکەوێ
خەڵکی گەر دەستی بڕا من چاوی ڕێی دەستم بڕا
یەعنی چاو مەبڕە لەدەست کەس ڕسقی دەست و پێت نەوێ

له غەزەلێكی تریشدا دیسان هەر ئیشارە بۆ كوێربوونی خۆی دەكا و دەڵێ:

كەسێ "ساڵح" بێ بۆ زیكر و دوعا گوێیت بەبێ چاوی
هەزار چاوساغی وا دێنێ بە چاو زیندوو بە دڵ مەیتە

حەریق لە نامە و نامەكاریشدا هەمیشە پەنای بردووە بۆ مرخ و قەریحەی شاعیرانەی خۆی و نامەی خەڵكیشی هەر بە شیعر وەڵام داوەتەوە، بە تایبەتی هەر نامەیەكی كە بۆ سەیید ڕەشیدی، شاعیر و شاگردی پێشووی نووسیویەتی لەگەڵ ئەم نامەشا غەزەل و چامەیەكی بۆ ناردووە كە لەو غەزەل و چامەدا داوای یارمەتی لە حەزرەتی شێخ كردووە و تكای لە سەیید ڕەشید كردووە كە چامەكە بۆ حەزرەتی شێخ بخوێنێتەوە و زۆربەی ئەم غەزەل و چامانەی كە مەلا ساڵی حەریق نووسیویەتی هەر لەو ڕێگەوە بە گوێی شێخ گەیشتووە و بۆی خوێندراوەتەوە، هەر وەكو لە غەزەلێكدا گوتویەتی:

گوڵ بژێرێكی زەریفم كرد لەنێو باغی خەیاڵ
خۆزگە مەردێكی "ڕەشید" بۆ "شێخی" بخوێندایەوە

حەریق كتێبی "گەلەنبەوی" لە مەلا عەزیزی مفتی سولەیمانی وەردەگرێ، هەرچەندە مەلا عەزیز داوای دەكاتەوە، ئەو هەر نایداتەوە و لە ئەنجامدا "حەریق" بە زمانی مەلا نەسروڵڵای باوكییەوە ئەم چوارینەیەی داناوە:

بـــابی کـــوڕێکی بـــوو، چـــە کـــوڕ، ئـــەربابی مەعنـــەوی
دەیکـــوت لـــە ڕووی نەســـیحەتەوە داییمـــەن بـــەوی
وە کـــە جـــەردەبی، دە ڕۆڵـــە لـــە عـــومری منـــت کـــەوی
نەیدەیتـــەوە بـــە مفتـــی ئەفەنـــدی گەلەنبـــەوی

حەریق، غەزەلێکی بەسەر دێڕەوە بۆ جەنابی سەیید ڕەشید ناردووە و بە ئاشکرا ناوی هێناوە.

لـەلام وابـوو کـە تـۆ سـەیید ڕەشـید یـاری لـە بـۆ یـاری
لـــە ملکـــی میهرەبـــانی دا لـــە یـــارانی وەفـــاداری

حەریق غەزەلێکی بەم سەردێڕە لە وەڵامی مامۆستا مەلا حەسەنی قازی "سیف القضات"دا نووسیوە کە داوای لە مەلا ساڵح کردووە کتێبی قازی و لاری بۆ بنێرێت کە یەکێك لە کتێبە فەلسەفییە کۆنەکانە و حەریق لەم غەزەلەدا ئیشارەتی بۆ دوو کتێبی "ئیشارات" و "شیفای"ی ئەبو عەلی سینا کردووە کە بە بۆنەی مەبەست و ناوەڕۆکەوە بە تەلمیحێکی جوان و دڵڕفێن ئیشارەی پێ کردوون.

لـە خزمـەت قازییـا لاریـم نییـە بـۆ سـەر چ جـای مـاڵم
چە حیکمەت بوو ئیـشاراتی نەفـەرموو بـۆ شیفای حـاڵم

مەلا ئەحمەدی رەببانی کە بە مەلای لاسوور ناسراوە، مەلایەکی زانا و بەناوبانگ بووە، لەگەڵ ئەوەش بە هۆی شان و قۆڵی خۆیەوە ژیاوە و هیچ ئاتاجێکی بە نانی مەلایەتی نەبووە، ڕۆژێك ئەم مەلا ئەحمەدی لاسوورە کارێکی بە حەریق دەبێ، یەکێك دەنێرێ بۆ لای کە کارەکەی بۆ جێبەجێ بکا و بانگیشتنیشی بکا بۆ لای خۆی، لەسەرەی ئەو شتانەدا کە دەیداتێ کاڵەکیشی بداتێ، چونکە مەلای لاسوور بێستانە کاڵەکێکی نایابی هەبووە، جا کاڵەك بێ و هی موکریان بێ و مەلای لاسوور کرد بێتی دەبێ چۆن بێ؟ بەڵام حەریق کە دێت مەلا کاڵەکەکەی ناداتێ، حەریقیش ئەم چارینەی بۆ دەنووسێت:

مەلا وەعدەی بە کاڵەکدا، شکاندی خەیاڵێکی لە دڵ دا بۆ گەیاندی
ئەگەر دەمزانی کاری تۆیە لاسور بەلای ڕەشتا بەسوکێ...

حەریق ڕۆژێك دەچێت بۆ ماڵی خوالێخۆشبوو قازی مونعیمی باوکی قازی کەریم و لە ماڵی ئەوانا دووپشکێك پێوەی دەدا، ئەویش هەر بەم هۆیەوە ئەم چارینەی هۆنیوەتەوە:

بە پشکێ رازییە قازی لە هەر ماڵێ کە دوو، پشکە
لە ماڵی خۆی لە بۆ خەڵکی هەمیشە حیسسە دووپشکە
بەڵێ، "مونعیم" دەبێ وابێ خوا کا ماڵی ئاوابێ
نەوەک خەڵکی کە ماڵیان ژەهری ماروونێشی دوپشکە

حەریق غەزەلێکی فارسی بەم سەردێرەی خوارەوە بـۆ کۆچـی دوایـی خوالێخۆشـبوو مەلا وەسیمی سەردەشتی داناوە و شیوەن و لاواندنەوەیەکی زۆر بـە کـوڵی بـۆ کـردووە و ساڵی کۆچی دیاری کردووە.

ای دریغا چشم علم ازدوریت بی نورشد

نور علمت دربصیرت طالبان رادور شد

جارێکیان سێ کەس ویستوویانە بچن بۆ زیارەتی شێخی بورهان لە دێی شـەرەفکەند و لە پاشان هەرسێکیان پەشیمان بوونەتەوە و نەچوون و لە ڕێگەدا گەڕاونەتـەوە، مـەلا ساڵحی حەریقیش کە ئەمەی بیستۆتەوە ئەم شیعرەی لە هەجویاندا داناوە:

سـێ کـەس بـە تەڵـەب بـوون لـە تەڵـەب چـوونەوە جـارێ

رابـــرد وە تەڵـــەب بێنـــەوە تـــا فەســـڵی بـــەهارێ

❊❊❊

## چەند سەرگوزشتەیەکی
## حەریق

مەلا سالّحی حەریق و مەلا ئەحمەدی لاسوور پێکەوە رەفیق دەبن، جارێکیان مەلا ئەحمەد هێندێ هەنجیری پێ دەبێ و لە حەریقی دەشارێتەوە و بەشی نادا، نزیکەی سالّێك بەسەر ئەمەدا تێدەپەڕێ، ڕۆژێك لە دێی مەرخوزی ناوچەی سەقز لە مەدرەسەی فەقێکان دا هەموو پێکەوە دادەنیشن، یەکێك لە فەقێکان تەفسیرێکی "بیضاوی" دێنێ و قسە لە سورەی "والتین"وە دەکەن، مەلا سالّح بیضاویەکە وەردەگرێ و سورەتەکە دەخوێنێ و دەلّێ: "الزیتون وطور سینین" مەلا ئەحمەد دەلّێ، کەی وایە بابە؟ سورەتەکە دەلّێ:

"والتین والزیتون وطور سینین"، حەریقیش دەلّێ تاخر ئەوەبوو پار تۆ "تین"ە کەت شاردەوە، "تین" هەنجیرە.

سالّێکی حەریق چاوی ئێشاوە و بۆ چارەسەرکردنی ئەم چاوئێشەیە چووە بۆ لای پزیشك و زانا و شاعیری ئایینپەروەری مەهابادی خوالێخۆشبوو حاجی مەلا عەبدوللّای مەولەوی کە نازناوی لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا "شەکیب" بووە، بەلّام بەداخەوە چاوئێشەکەی چاری نەکراو حەریق چاوەکانی کزوکەم بینا بووە، ڕۆژێکیان یەکێك لە دۆستان و ئاشنایانی لێی دەپرسێ و پێی دەلّێ: ئەرێ مەلا سالّح چاوەکانت چۆنن؟ حەریقیش لە وەلّامدا دەلّێ: بە خوا کاکە جەنابی مەولەوی دەلّێ چاوەکانت چاکن.

حەریق لە دوا سالّەکانی ژیانی دا کە ماوەیەك لە جێگەدا کەوتووە، برینێکی گەورەی لە جەستە و لەشی پەیدابووە دوکتور وێنەتان کە لەو سەردەمەدا لەشاری مەهاباد نیشتەجێ بووە.. ویستویەتی برینەکەی دەرمان کا، لە کاتی مودا وا کردنا پێی دەلّێ: مامۆستا بێ زەحمەت وەرگەڕێ، حەریقیش لە وەلّامدا دەلّێ: ئاغای دوکتور هێندەم دەرد و بەلّا دیوە هەر ئەوەندەم ماوە وەرگەڕێم!

# مێژووی ژیانی عارفی ڕەببانی
# شێخ "شەمسەدینی بورهانی"

خــــودا ناســــی پایـــە بـــەرزی بارەگـــای ســـــوبحانی
ســـــەر قافلـــــەی عابیــــدان و ســــۆفیانی رووحـــــانی
لـــە ئاســـمانی عیرفانـــا خـــۆرێکی تروســـکەدار و نـــووراني
بۆیـــە نێوبـــانگی دەرکـــردووە بـــە "شەمـــسی بورهـــانی"

خۆری تروسکەداری ئاسمانی ئایین و عیرفانی ئـەو باسـەمان نێـوی یوسـف و نێـوی بـاوکی "محەمەد" و نێوی دایکی "ئایشەیە" باوکی لە تایفەی "ماوەت" و دایکی لە هۆزی "کەلهور"ە لە ساڵی ١٣٤٢ کۆچی مانگی لە دێی "سێلۆی" لـە ئاوایـیـەکانی ناوچـەی "لاجـان" هاتۆتـە دنیاوە، هەر بە منداڵیی باوکی کۆچی دوایی کردووە و دایکی چون هەر ئـەو کـوڕەی بـووە، زۆری خۆش ویستووە و بە پێی دابونەریتی ئـەو سـەردەمە ناویەتیـە بـەر خوێنـدن و قورئـانی پـیرۆزی تەواوکردووە و چەند کتێبێکی خوێندووە و بووە بە فـەقێ و هێنـدێك کتێبـی نـەحو و سـەرف و شەرعی خوێندووە و ئەوجا بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕووی کردۆتە شاری "مەهاباد"و لـەلای گـەلێ لە زانا پایە بەرزەکانی ئەو سـەردەمە خوێندویـەتی، دایکـی بـۆ ئـەوەی هەمیـشە چـاوەدێری و ئاگاداری لێ بکا، ماڵی چووتە دێی "پالاوە" کـە بـە ٣ کیلـۆمیتر کەوتۆتـە ڕۆژهـەڵاتی شـاری "سابلاخ"ەوە، ئەو زاتە هەر بە منداڵیی نیـشانەی هۆشـیاری و بەختـەوەری و گـەورەیی بـە نێـو

چاوانییەوە دیاربووە و شێوەی سالْحان و پیاوچاکانی بە خۆیەوە گرتووە و لە فەقێیـەتی دا زۆریـش بە خوداپەرستییەوە خەریکبووە و نوێژی سوننەت و شەونوێژی هەمیـشە کـردووە و ئـارەزووی لـە سۆفیەتی و سولوك بووە، لەسەر ئەو ئارەزووە شەوێك خـەوی بـە خـودا ناسـی پایەبـەرز و پـیری مورشیدی نێو بە دەروەی تەریقەت خودا لێخۆشبوو حەزرەتی شێخ عوسمان سـیراجەدینەوە دیـوە و لەو خەوەدا حەزرەتی شێخ بانگی کردووە بۆ "تەوێڵە".

دڵە دامـرکێ خـەیـاڵ لێـم لادە گیانە بۆ دیتـنـی پــیـر ئـامادە
رۆژی تینی بە گەشەو زەنوێزە رۆژی دینی گەش و تیشک رێژە

شێخ یوسف شەمسەددین دوای چـەند رۆژ بیرکردنـەوە هـەواڵی نیـازی سـەفەری خـۆی بـۆ "تەوێڵە" لەنێو فەقێکان و هاوڕێیان و دۆستەکانی دا بڵاودەکاتەوە و رۆژێك لـە رۆژان لـە شـاری "مەهاباد"وە بەرەو شاری "سەردەشت" دەکەوێتەڕێ و دوای چەند رۆژ مانـەوە لـەو شـارە لەگـەڵ چەند کەسێك لە دانیشتوانی "سەردەشت" چووە بۆ "تەوێڵە" و بـە خزمـەتی پـیر و مورشـیدی خۆی شێخ سیراجەدینی نەقشبەندی گەیشتووە و تکای لێکردووە کە شـێوەی تەریقـەتی فێربکـا، حەزرەتی شێخیش زۆری دڵخۆشی داوەتەوە و بەوپـەڕی سـەفاو و لوتفـەوە تکاکـەی وەرگرتـووە و شێوەی تەریقەتی نەقشبەندی فێرکردووە و نیشانی داوە چون ویرد و زیکری خـۆی بـەجێ بینـێ و بەو جۆرە بووە بە مریدی شێخ عوسمانی سیراجەدین و ماوەی پازدە ساڵ لە دێی "تەوێڵە" ماوەتەوە و لەو ماوەیەدا وەکو مریدێکی بەسۆز خەریکی خوداپەرسـتی و ریـیـازەت و تەزکییـەی نـەفس و سولوك و بەجێهێنانی شێوەی تەریقەت بووە و کاتی خۆی بە فیڕۆ نەداوە و بە هەموو جۆرێـك بـە شێوەی تەسەوفەوە خەریکبووە و رۆژ بە رۆژ بووە بە جێگـای تـەوەجەجوهاتی شـێخ و بـەردەوام لـە بەرزبوونەوەدا بووە.

# گەڕانەوەی "شێخی بورهان"
# بۆ ناوچەی "موکریان"

شێخ یوسف شەمسەدین پاش تەواوکردنی دەورەی سەیر و سولوك لە سەفەرێکدا کە لەگەڵ حەزرەتی شێخ عوسمان سیراجەدین دەچێت بۆ شاری "سولەیمانی" بە فەرمانی شێخ لە خانەقای خوداناس و مورشیدی نێو بە دەرەوەی تەریقەت خوالێخۆشبوو حەزرەتی "مەولانا خالیدی" نەقشبەندی شێخ عوسمان ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی دەدانێ و پێی دەفەرمووێ کە بگەڕێتەوە بۆ ناوچەی موکریان و دەست بکا بە ڕێگا پێشاندانی ئەوانەی بە دوای ڕێگای خوداناسیدا دەگەڕێن، شێخ یۆسفیش ئامادەیی خۆی بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی شێخ عوسمان پێشان دەدا، پاش ئەوە "شێخ یۆسف" دەکەوێتە ڕێ و دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی "موکریان" ماوەیەك لەگەڵ دایکی لە دێی "پالاوەی سەرێ"دا دەنیشێ و لەوێشەوە و لە پاشان کۆچ دەکا و دەچێتە ئاوایی "بورهان" هەر لەو شوێنە شێخ یۆسف کە لە دێی "بورهان" نیشتەجێ دەبێ دەست دەکا بە سولوککردن و بەجێهێنانی شێوەی تەریقەت و ڕێنوێنیکردنی موسوڵمانان بە پێی دابونەریتی تەریقەتی نەقشبەندی و خانەقایەکی گەورە لە دێی "بورهان" دروست دەکا و ئەو خانەقایە هەر لەوکاتەوە بە خانەقای "شێخی بورهان" ناوبانگی دەرکردووە و ماڵ موڵکێکی زۆری لەسەر وەقف دەکا و زانایان وە ئەهلی تەریقەت لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێدەکەن، شێخ لەو ماوەیەدا کە دەست دەکا بە ئیرشادی تەریقەتی نەقشبەندی خەڵکێکی زۆر لە زانایان و ڕووحانیان و داخوازانی سولوك لە هەموو لایەکەوە دێن بۆ

خزمەتی و تەریقەت لە سەردەستی وەردەگرن و نێوبانگ و شۆڕەتی بە هەموو لایەکدا بڵاودەبێتەوە و مرید و مەنسوب لە هەموو لایەکەوە دادەبارێن بەسەریدا، گەلێك پیاوی گەورە و کەسانی پایەبەرزی وەك و مەولانا "محەممەد سادقی مەرزنگ" خوداناس و عاریفی بە نێوبانگ حاجی سەییدمحەمەد سەعیدی نوورانی "هۆنەری هونەرمەند و بەهرەمەند خوا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا "سەیید ڕەشید "کاکەڕەش و کەسانی دی لەسەر دەستی شێخ یۆسفدا سولوکیان کردووە و تەربیەتی رۆحی سۆفیانەیان وەرگرتووە.

***

# "سەفەری حەج"

هەر لەو ماوەیەدا "شێخی بورهان" ویستوویەتی بچێت بۆ حەج و فەرزی حەج بەجێ بێنێ، هەموو شتێك ئامادەکراوە و چەند کەس لە مریدەکانی کە یەکێك لەوان زانا و شاعیری ئایینپەروەر و سۆفی سەیید محەمەد سەعیدی نورانی کەلە سەیدەکانی "کولیجە" بووە لەگەڵ شێخی بورهانی لە ڕێی وڵاتی عوسمانی و میسرەوە چوون بۆ ماڵی خودا و لە ڕێی "دیمەشق" و "بەغدا" و "هەولێر"ەوە هاتوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان، هێشتا شێخ یوسف لە سەفەری حیجاز نەگەڕاوەتەوە کە زانای خوداناس مەولانا "محەمەد سادقی مەرزنگ" مریدی دڵسۆز و دروستکار بە یارمەتی مرید و مەنسوبەکانی تر دودانگی دێی "شەرەف کەند"ی کڕیوە کە بە سی و پێنج کیلۆمەتر کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری "بۆکان"و شێخ یوسف دوای گەڕانەوە لەو دێیەدا نیشتەجێ بووە و خانەقا و چەند هۆدەیەکی لەوێ دروست کردووە چون نێو بانگ و شۆرەتی ئەو زاتە لە ئاوایی "شەرەف کەند"ەوە بە هەموو لایەکدا بڵاودەبێتەوە مریدان و مەنسوبان بە تایبەت زانایان و ڕۆحانییان لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانەوە دادەبارین بەسەریدا، هەر ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە لە دێی "شەرەف کەند" نەمێنێتەوە، هەر بەو هۆیەوە لە پارچە زەوییەکدا کە بە سولاوکان بەنێوبانگە و بە دوو کیلۆمیتر کەوتۆتە ڕۆژئاوای "شەرەف کەند"ەوە خانەقایەك و چەند حوجرە و خانووی لێ دروست کردووە و ئەو شوێنە هەر لەو سەردەمەوە بە "خانەقا" دەمێنێتەوە، ئەوەی شایانی باس بێ ئەوەیە کە دوای چەند ساڵ نیشتەجێ بوون لە "خانەقا" ئاوایی "ئاتابلاغی" کڕیوە کە بە دە کیلۆمیترێك کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری "بۆکان"و ڕووبەڕووی دێی "حاجی لەك"ی شار وێرانە و ئەو دێیەشی وەقفی "خانەقا" کردووە.

## شێوەی شێخ یۆسف

شێخ یوسف شەمسەدین پیاوێکی جوان چاك و باڵابەرز و سوورکارە و ڕیشێکی تەنکی بووە و ڕووخساری وای نیشانداوە کە لەپێشدا قەیافەیەکی بە هێزی بووە، بەڵام عیبادەت و ڕێیازەت و نوێژکردن و ڕۆژوگرتن و چلە نشینی و نەفس کوژی و ساڵانی سەردەمی سولوك و هەڵگرتنی باری قورس و گرانی ئیرشاد بڕستی لێ بڕیوە و جەستە و ئەندامی کزو بێ هێز کردووە، شێخ یۆسف پیاوێکی قسەزان و ڕەوانبێژ و ڕاکێشەر بووە و لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا بە زمانی خۆیان قسەی کردووە و لە خۆنواندن و خۆبەزلزانین و فیز و دەعیە بێزار بووە و زۆر هێمن و لەسەرەخۆ قسەی کردووە، کاتێ کە بزە و زەردەخەنە هاتۆتە سەر لێوی پشتی دەستی لەسەر دەمی داناوە و هیچ کاتێ بە قاقا پێنەکەنیوە.

## خێزان و منداڵەکانی

شێخ یۆسف هەر کە چووە بۆ دێی "بورهان" یەکەم ژنی هێناوە و خێزانی یەکەمی کە ژنێکی زۆر پاك و پارێزگار بووە نێوی "خانس خاتون" بووە و ئەو ژنەی دوای ماوەیەك بەبێ ئەوەی منداڵێکی ببێ کۆچی دوایی کردووە، خێزانی دووەمی کچێك بووە لە سەیدەکانی "کولیجە" و نێوی سەییدزادە "مروت" بووە و لەو خێزانەی سێ کوڕ و سێ کچی بووە، کوڕەکانی نێویان شێخ "عەبدوڕەحمان"و شێخ

"ئەحمەد"و شێخ "عەبدورەحیم" بووە و کچەکانیش "زەینەب خاتوون"و "خەدیجە خاتون" و "فاتیمە خاتون" بوون، خێزانی سێیەمی نێوی "یاسەمەن خاتون" بووە و چوار کورو کچێکی بووە، کوڕەکانی نێویان "شێخ عەبدوڵا" و "شێخ ئیبراهیم" و "شێخ محەمەد" و "شێخ عەبدولقادر" و کچەکەشی نێوی "ئامینە خاتون" بووە خێزانی چوارەمی بێوەژنێك بووە بە نێوی "سەیدزادە ئامین" کە لەپێشدا ژنی خوداناسی پایە بڵند خوالێخۆشبوو حاجی "سەیید محەمەد سەعیدی نووڕانی" خەلیفە و مریدی دروستکاری بووە کە دوای وەفاتی ئەو پیاوە گەورەیە و بەڕێزە لە ساڵی ١٣٥٦ی کۆچی مانگی، بۆ ئەوەی منداڵەکانی بێ سەرپەرشت نەمێننەوە ئەو ژنەشی مارەکردووە و لەو خێزانەشی چوار کوڕ و کچێکی بووە، کوڕەکانی نێویان "شێخ ساڵح" و "شێخ حەسەن" و "شێخ عەلی" و "شێخ حوسێن"و کچەکەشی نێوی "مریەم خاتون" بووە.

## کۆچی دوایی شێخ یۆسف

ئەو پیرە بە بیر و ژیرە سەرئەنجام لە شەوی یەکشەممەی یازدەی مانگی دووەمی ساڵی ١٣٢٨کۆچی مانگی لە تەمەنی هەشتاو شەش ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و پاش شووشتن و کفنکردنی، ژمارەیەکی زۆر لە خەلیفە و مرید و مەنسوبەکانی لە هەڵگرتنی جەنازەکەی دا بەشداریان کردووە و لە پێنجسەد میتری ڕۆژئاوای "خانەقا"وە لەسەر تەپۆڵکەیەك بە خاکیان ئەسپاردووە، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە دوای وەفاتی شێخ، مەولانا محەمەد سادقی مەرزنگ کە خەلیفەیەکی شایان و لێهاتووی شێخ "شەمسەددین" بووە لەسەر خانەقا" ماوەتەوە و سەرپەرشتی کاروباری دینی و دنیایی "خانەقا"شی کردووە و لە هەموو لایەکەوە خەڵك ڕوویان تێکردووە و هەمیشە "خانەقا"

پڕ بووە لە مرید و مەنسوب کە لە زۆر لای کوردستانەوە هاتوون. "مەولانا" پیاوێکی هۆشیار و زانا و شارەزای ئوسولّی دین و تەریقەت و مەلایەکی باش بووە و بۆ کاروباری دنیای خانەقاش هەر وا لێهاتوو بووە، سەرئەنجام ئەویش تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی دەکا بە ئیرشادکردن و ڕێنوێنی موسولّمانان و خزمەتکردنیانەوە خەریك دەبێ و داخوازانی زۆری تەریقەت لە هەموو لایەکەوە لێی کۆدەبنەوە، سلاّوی خودا بەسەر گڵکۆکەیاندا بڕژێ وەك بارانی "بەهار".

## یادی "شێخی بورهان" لە "یادی مەردان"دا

ئەم زاتە ناوی یۆسف لەقەبی شەمسوددین و خەڵکی دێی "بورهان" و لە هۆزی "بلّباس" بووە، پاش ئەوەی لە خوێندندا ئەگاتە پلەو پایەیەکی بەرز، ئەڕوا بۆ هەورامان و لەسەردەستی شێخ عوسمان سیراجوددیندا تەمەسوك ئەکا و خەریکی ئادابی تەریقەت ئەبێ، تا پاش ماوەیەك ئیجازەی خەلافەت وەرئەگرێ و ئەگەڕێتەوە بۆ ولاّتی موکریان و دەست ئەکا بە ئامۆژگاریکردن و ڕێ پیشاندانی موسولّمانان، ئەم زاتە یەکەم جار لە دێی "بورهان" و پاشان لە "شەرەفکەند" و ئەوجا لە "سولاف کان" ئیرشادی کردووە، لەمەی دواییاندا خانەقای دروستکردووە، ئەم زاتە گەلێ سیفەتی پیاوانەی تێدا بووە وەك ئەوەکە:

١) لەسەر هەموو موریدێکی پێویست کردووە ئەگەر نەخوێندەوار بێ دەرسی قورئان بخوێنێ بە تەجویدەوە و هەموو ڕۆژێ بە گوێرەی توانا دەوری هەندێکی بکاتەوە.

٢) ئەهمیەتدانی بە سوننەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ، بە تایبەتی لە ئادابی دەستنوێژ و ڕۆژ و مەناسیکی حەج دا.

٣) بڕیاریداوە لەسەر هەموو مەنسوبێکی کەنانی کاسبی و ڕەنجی شانی خۆی بخوا، مەگەر تووشی دەردێکی وا بووبێ کە ڕێگای کاسبیکردنی لێ گرتبێ، ئەوە ئەتوانێ دبنیشێ و خەڵك خزمەتی بکەن.

٤) خۆیشی بە خۆی کاسبی کردووە و نانی خانەقای لە کەسبی دەستی خۆی داوە و ساڵانە ئەوەندە بەروبووی کاسبی و کشتوکاڵی بووە زەکاتی ماڵی بە گەلێ کەسی هەژار و کەم دەسەڵات داوە و دێی "ئاڵبلاخ"ی کڕیوە وەقفی کردووە بە هەژاران و کەسانی عیبادەت کار و ڕێبوارانی خانەقاکەی.

٥) کە لە ساڵی ١٣٢٨ کۆچی مانگیدا نەخۆش کەوتووە و هەر لەو ساڵەدا بەو نەخۆشییە کۆچی دوایی کردووە، وەسیەتی کردووە لە کوڕانی کەسیان جێی نەگرێتەوە، چونکە کەسیان سولوکی تەریقەتی نەبووە و شایانی ئیرشادکردن نەبوون.

کاری وا لە هەموو کەسێك ناوەشێتەوە و نیشانەی پلەیەکی بەرزی ڕاستگۆییە لەگەڵ خودا و خۆ و خەڵکدا ، بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری ئەوقافی خانەقاکەشی ناوی دوازدە کەسی بە ڕیز هێناوە، هەروا بڕیاریداوە پاش مردنی ئەو دوازدە کەسە هەموویان ئەهلی خانەقا خۆیان یەکێك هەڵبژێرن و بیکەن بە سەرپەرشتی کەری کاروباری خانەقا و ئەوقافی خانەقا، لە ئەنجامی ئەم ڕەوشتە بەرزانەیەوە بووە، شێخ موحەمەدی کوڕیشی وا پەروەردە بووە کە وا لەگەڵ ئەوەیش کە مەلایەکی زانا و پایە بڵند بووە نەیهێشتووە بە ناوی شێخیەتییەوە کەس دەستی ماچ کات، شێخ بورهان بەسەر تەپۆلکەیەکی بەرزەوە لە نزیکی خانەقاکەیا بە خاك سپێرراوە.

یادی مەردان بەرگی دووهەم

لاپەڕەی: ٥٠٣-٥٠٤

نووسراوی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس بیارە

## شێخی بورهان
## لە "رشتەی مرواری"دا

بورهان گوندێکە لە وڵاتی موکریان، شێخێکی لێ بووە بە ناوی شـێخی بورهانـەوە ناوی دەرکردووە، ناوە ئەسڵیەکەی "یۆسف" و لەقەبی شەمسەدین بووە سەردەمی ژیـانی سەدەی نۆزدەهەم بوو، شێخی بورهان یەکێك بـووە لـە شـێخە پایەبـەرزەکانی سـەر بـە بنەماڵەی شێخانی تەوێڵە کە کوڕی ئاگردانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، بووە. پایـەی شێخی بورهان شێخی راستەقینەبووە، خۆی پیاوێکی دەوڵەمەندی بەرسـاتی دەوڵەمەنـد بووە، دەوڵەمەندییەکەی لە کۆششی خۆی و لە میراتی باووباپیرەوە بۆ ماوتەوە، چاوی لە دەستی خەڵك نەبوو، نانی داوە بە خەڵك، نانی کەسی وەرنەگرتووە، لـە مـاڵی تایبـەتی خۆی "٣٥" مانگا، پێنج جووتە گا و دە ئێستری تـەرخانکردووە بـۆ خانـەقا، گـاوان و جووتیار و دارکێشی بۆ ڕاگرتوون، شیری ئەم مانگایانە بۆ ماست و دۆی ئاوەن و ڕەوەنـی مریدانی خانەقا، بەرهەمی جووتەکانیشی بۆنانی خانـەقا، ئێسترەکانیش هـەموو ڕۆژێ نێرراون بۆ دار و سوتەمەنی خانەقا، ئـەو عالەمـە لـە دوور و نزیکـەوە هـاتوون نـان و شۆربا و هەموو شت حازربووە، چەندە لەوێ مابێتەوە بە زیکر و فیکرەوە ڕایـان بـواردووە ئەگەر مریدەکانیش شتیان هێنابێ پیاوی تایبـەتی هـەبووە لێـی وەرگرتـوون هـەر لـە خانەقادا عەمار هەبووە براوەتە ئەوێ و دەرخواردی مریدان دراوە بەبێ ئەوە تێکـەڵاو بـە ماڵی شێخ کرابێ، ڕابواردنی خۆیشی وابوو، گوێدرێژێکی هەبوو هەموو ڕۆژ سواری بووە چووە بۆ سەر ڕەز و زەوی و زاری خۆی، خۆی بە دەستی خۆی بژاری ڕەزی کردووە، بێڵکاری

کردووە، بە دەستی خۆی گەنمی وەشاندووە، ئاوی داوە و درووییەتەوە، شەن و بـای کـردووە، بردوویەتە ئاش هاڕیویەتی، لەوە نانی بۆ دروستکراوە، وەکو بڵێیت دائیما لە ڕیبـازەت و چەوساندنەوەی نەفسدا بووە، زۆرتر خواردنی لە نان و شۆربا بووە کـە خـۆی بـە دەسـتی خۆی هێناویەتیە دەست، میوەی ئەخوارد ئەویش هەر لەوە کە خۆی بە دەستی خـۆی لـە ڕەزەکانا ئەیهێنایە ئەنجام، هەموو دەم دەرزی و دەزووی پێ بووە جلەکانی خۆی پـێ درووە بە هیچ جۆر ئەرکی نەئەخستە سەر کەس، لە کۆڕی مراقبەی سۆفیەکانا ئەچـوو سـەری ئەنا بە سنگیانەوە مراقبەی ئەکردن، هەموو ساڵێکیش چلەی ئەکێشا ئەمە بوو شـێخی بورهان.

رشتەی مرواری : بەرگی حەوتەم
مامۆستا عەلائەدین سەجادی: لاپەڕە
١٦١-١٦٢

## خوورِەوشتی شێخی بورهان

خوالێخۆشبوو"شێخی بورهان" پیاوێکی خوداناس و خۆپـارێز و شـێوە جـوان و لـە خوداترس و ئاییـنپەروەر بووە و دڵی بە نـووری خوداناسـی ڕوونـاك بـووە و ئامۆگـاژی و ڕێنوێنی موسوڵمانانی کردووە، هەر لە منداڵییەوە نیشانەی زیرەکی و ڕێز و خوورِەوشتی بەرزو پیرۆز لە نێو چاوانیدا دەرکەوتووە، بۆیـە زۆربـەی شـاعیرانی کـورد بـە کـوردی و فارسی لە وەسف و ستایشی دا شیعریان گوتووە، هەروەکو بە کۆچـی دوایـشی شـێواوی کەوتۆتە نێو دڵ و دەروونـی بەشـێکی زۆر لـە شـاعیران و گـەلێ کـەس لـە هۆنـەرانی سەردەمی خۆی بۆ لاواندنەوە و کۆچی دوایی ئەو پـیرە پـیرۆزە هۆنراوەیـان هۆنیوەتـەوە و شینیان بۆ کردووە و هەستی جوان و بە کوڵیان دەربڕیوە کە ئەوا هەسـتی هەنـدێ لـەو هونەرانە بەرامبەر بـە شـێخ دەخەینـە ڕوو، چـەند پارچـەیەکی کـوردی یـان لێ هـەڵ دەبژێرین.

## یوسفی میسر

ئـــەی عـــەزیزی حـــەزرەتی پـــەروەردگاری بـــە رەفیـــق

قـــوتبی عالـــەم، پیـــری دانـــا، یوســـفی میـــسری تـــەریق

خوسرەوی دەرویش کیسوەت سەروەری قەیسەر غولام

ئەفـــسەری شـــاهانی عالـــەم مورشـــیدی خاقـــان رەفیـــق

دیـن نـەمابوو بێ وجـودت دیـن بـە تـۆوە نەقـشی بەسـت

دین نگین، تـۆ بـوی بـە خاتـەم، ئـەو موسـەجەع تـۆ عـەقیق

هـــەر غـــەریقێ یـــادی تـــۆی بـــێ غیرەتـــت مەللاحـــە بـــۆی

گـومرەهی سـاحیل نـشین بـێ یـادو زیکـری تـۆ غـەریق

حـــەنزە لـــە بـــێ شـــەربەتی میهـــرت لـــەمینو سەلـــسەبیل

سەلـــسەبیلە بـــێ مـــەزەی قـــەهرت لـــە مینـــادا رەحیـــق

فـەیزی تـۆ بـاران و مـونکیر کـوێر و خوبـسی دڵ قـوڕاو

هەڵخلیـسکی پێـی ئەگـەر مەسـموعە پـێم عـوزری زەلیـق

دیـــن و ئیرشـــاد و تەریقـــەت هـــەر بـــە تـــۆ شایـــستەیە

وەک بـە شـانی حـەزرەتی سـەیید، ریـسالەت بـوو حـەقیق

کـەی دەگـا قوربـان بـە پایـەی عولـوی کـاخی هیممـەتت
وەهـم و فکـری هـەردوو عالـەم گـەر ببێتـە مەنجـەنیق
وەسـفی نـووری عـەرش گیـرت دێتـە تەشـریح و بـەیان
گەر لە هاوەن دا بە سـەنعەت پەرتـەوی مەهــ بێ سـەحیق
نەقــشبەندی بــێ میــسال و قــادری قــودرت بــەدیع
تــۆی لەسـەر پـەردەی بـەقا کێـشا بـە ئـەخلاقی خـەلیق
ســاحێبی خــولقی جــەمیل و داوەری حوســن و جــەماڵ
میهرەبــان و خــۆش زبــان و رەحــم کــردار و شــەفیق
کـەم تەکـەببور، بەهـەوەس، خـاڵی لـە نوقسان، پـڕ کـەماڵ
دڵ قەوی، مـونکیر نـەوی، فیتـرەت عـولا، فیکـرەت دەقیـق
گەوهــەری زاتــت ســەنای نایــە بــە دەریــای فیکــرەتم
فکـری مـن غەوواسـی نـادان بـەحری جـودی تـۆ عـەمیق
دەم بــە دەم شــادان و خــورەم بــی، ئیلاهــی بــێ مــەلال
وەک لـە ئـەبری بەهمـەنی خەندانـە نەسـرین و شـەفیق
دوو کەسـن قوربـان لـە مەحـشەر ببیـە شـافیعیان ئەگـەر
یەک "ئەدەب" بەندەی قەدیمو یەک سەنا خوانت " حەریق

مصباح الديواني "ئەدەب"

## قوتبی ئیرشاد

خودا تۆبە لە دەس ئەو دلبەرە شۆخە، چ خوێن ڕێژ و چ سەففاکە
دەگەڵ تیپی موحیببانی چ بێ ڕەحم و چ بێ باکە
دڵ و جانی بە غارەت بردم و ڕەحمی نەکرد جارێ
لە مەشقی دڵبەری یارەب چ مەزبوتە، چ چالاکە
لە جەرگەی ئەولییا تاقە، وەکو خورشیدی ئافاتە
شەهیدی عیشقی مەولایە موحیببی شاهی لەولاکە
دەزانی فەردی ئەوتادە، کەسێکی ساحێبی زەوقە
دەزانی قوتبی ئیرشادە، کەسێکی ئەهلی ئیدراکە
ئەگەر حەققت دەوێ ئەلحەق ویلایەت خاسە بۆ زاتە
ئەگەر ڕاستت دەوێ ئوستادی کامیل مورشیدی چاکە
لە من بۆ تۆ وەسییەت بێ لە هیچ لا، لامەدە ئەی دڵ
بەجڵدی و چابوکی بۆ زیارەتی خاکی بڕۆ، ڕاکە
هەتا هەم "حەیدەری" کەمتر غولامێکم لەبەر دەرکی
هەتا هەم خادیم و جاڕوکەشم لەو مەرقەدە پاکە

عەلی بەگی سالار سەعید

(حەیدەری)

## شیعری دۆمانه

پەرگـــەمای قـــەلبم بـــە ڕشـــتەی میهـــری مـــەولا ڕۆنـــرا

ئیـدی غـەم نـاخۆم کـە مـشتەی غـەم پـەڕۆی دڵمـی کوتـا

خولخولـەی قـەلبم کـە سـەرگەردانی غـەم بـوو ئـەم هەلـە

چاک لە سەحرای عیشقی مـەولا هـەر وەکـو مـەزرەق چـەقا

گـــەر درێـــشەی غـــەم دڵـــم کـــون کـــا چ بـــاکێکم دەبـــێ

تیرەیـــی عیـــشقی دەکێـــشێ پێکـــەوە چەســـپی دەدا

بـەو میـسالەی گـەر لـە خـەرمان تـا وەکـو خـەرمانی دی

سـەعیی لـێ بکـەی دڕوی غـەم کـارێکی هـەرگیز لـێ نـەکا

هەرچـی حەشـوی "ماسـواک"ە بـو بـە شـفرەی پیـری خـۆم

وا بەلووســـی رامبـــڕی ئەســـڵەن ســـەری تـــاری نـــەما

قـەلبی کونکـون وەک کـەوم قـەت ئـاوی غـەم ڕانـاگرێ

چـونکە سـیرمەی تـا روپـۆی وی تونـد بـە دولایـی تـەنا

ئاسـمان بێـژینگ و هێڵـەگ بـوو لـە بۆیـە فـەیزی حـەق

بـــۆ مریـــدی "شـــێخی بورهـــانی بـــە بـــاران ڕۆ ڕژا

بـا حەواڵـەی پاشـی مـونکیر بـێ سـەری نـووکی کـەڵاش

چـونکە عـەو عـەو وا لـە شـوێنی پادشـا هـی دیـن دەکـا
شـــیعری دۆمانـــەی "ســـەعیدی" هـــیچ عـــەیبێکی نییـــە
چـونکە دۆمـی دەرکـی مـەولای مـن دەبـن هـەر پادشـا

حاجی سەیید محەمەد سەعیدی کولیجی

نورانی"

## گیراوی داو

مــن لــە گــوڵزاری ئــەزەل گیــراوی داوی زوڵفــی تــۆم
بــەس بــدە چــەرخم لەســەر، بــازم کــە تیــری ڕســتە بــۆم
دڵ لــە بــۆ ئــاوی بــەقای تــۆ کەوتــە نێــو زوڵماتــەوە
دەســتی مــن دامــانی زوڵفــت پــێم بڵــێ بــۆ کــوێ بــڕۆم؟
قــووەتی قــەلبم کــە تــۆیی و قــووتی ڕۆحــم عیــشقتە
بــۆچ دەبــێ بــاکم لــە ماســیوا ببــێ، غــەم بــۆچ بخــۆم؟
یۆســفی میــسری ویلایــەت ئــەی خــەلیلی بــاغی قــودس
نــاری نمــروودە دەڕۆن، بــێ تــۆ دوچــاوم بــۆ نەچــووم
مـن بەسـەر کەوتومـە بـەر پێـی زوڵفـی وەک چـەوگانی تـۆ
هـەر لـە تفلیـی مـن ئەسـیری لوعبـەتی چـەوگان و گـۆم
بـو تـەوافی کەعبـەیی کـۆی "شەمـسی دینـە" وا "حەسـەن"
هەر وەکـو مـەزرەق بەهـەر مـەرز و دییـا ڕێ خـول دەخـۆم

## شەمسەدین

یارکە دێتە سەر گوڵ و ئەستێرە

سەیری ئەو دەکەن مانگ و ئەستێرە

ئەگەر دەتەوێ دونیا و قیامەت

ڕووی خۆت لەو دەرکە قەت وەرمەگێڕە

هەر کەس دەپەنای شێخی دا نەبێ

حیزی نەفسییە، شەیتان پێی فێرە

هاتنی ئەو دەرکەت قەت لەدەس مەدە

سەرومالی خۆت بێرە بسپێرە

نێوی شەمسەدین ڕۆژە کە هەڵدێ

هەروەک چەکچەکی هەڵدێ ئەو کوێرە

فەیز و بەرەکەت وەک باران دەڕژا

هەر کەس بە ڕاست بێ ئاخر بەخێرە

***

مامۆستا : "سیف القضات"

## غونچەی گوڵستان

عـــاشقـی غونـــچـــەی گوڵســـــتـــانم ئـەمـــن

بـــــۆیە وەک بولبـــــول غەزەڵخوانـــــم ئەمـــــن

دیـــدەو و دڵ ساعـــەتـێ ئـاســـــودەنیـــن

چـــاوەڕێـــــی دیـــــداری یـارانــــــم ئـــەمـــــن

بـەڵکە بەحـری رەحمەتی تۆ بێتـە جۆش

هــــــەر بــــە ئـــــومێد هـــــەور و بـــارانم ئەمـــــن

کەمترین بەنـــــدەم لە دەرکی "شەمسەدین"

هـــــەر غـــــوڵامی "شـــێخی عوســــمانم" ئـــــەمن

مـوخلیسـی سەییـد، مـوحیبی "سـادقـم"

جـــان فیداکــــەی عـــــەبدی ڕەحـــــانم ئەمـــــن

غەیـری شەڕ خـێرم لەعومری خۆم نەبوو

لــــەو شـــــەڕە یـــا رەب پەشیمـــــانم ئـەمـــــن

"حەیــــدەری" قەت نامـــــەوێ شان و مەقام

بەســـــمە بەنـــــدەی "شەمـــــسی بورهــــانم" ئـــــەمن

# یۆسفی خۆم

خەسـتەیی تیـری نیگـاهی چـاوی جانـانم ئـەمن
عاشـقی شـەوقی جـەماڵی مـاهی تابـانم ئـەمن
پیری کـەنعان نـیم بـلا بـۆ یۆسـفی خـۆم ڕۆژوشـەو
گریەوزاریمـە هـەر وەک پیـری کـەنعانم ئـەمن
عاشـقت بـاکی لـە تەهدیـدی قییامـەت هـەم نییـە
عاشقی بێ ترس و خـەوفم مـەردی مەیـدانم ئـەمن
بەعدەها جاهو جەلالم "حەیـدەری" بـەس بـۆ چـییە
هـەر غـولامی ئاسـتانی "شەمـسی بورهـانم" ئـەمن

عەلی بەگی سالار سەعید
"حەیدەری"

## پیری بورهان

گیان لەڕێ چوونی بە لەز دەمدا هان
کەوتە بەر کێشەری "پیری بورهان"
مانگە زەرد بوویەوە؟ ڕۆژت دیوە؟
دیارە تۆ بەر لە منت ناسیوە
دڵە دامرکێ خەیاڵ لێم لادە
گیانە بۆ دیتنی پیر ئامادە
گومبەزی سپییە وەکو ڕووی چاکان
پاکە وەک گیان و دڵی دڵ پاکان
سەدەفە و گەوهەری یەکتای تێدا
بارەگا هێکە شەهەنشای تێدا
ماڵی سەرخێڵی خوداناسانە
بێرەدا چوونە بەهەشت هاسانە
لێرە کەشکۆڵی هەژاری تژییە
هەرچی ئێرەی هەیە چاوی لەچییە؟
ڕۆژی تینی بەگەشە و تیرێژە
ڕۆژی دینی گەش و تیشک ڕێژە

تیـــــشکی ئـــــەوکاری بـــــە خـــــۆڵ و خاکـــــە

شـــــۆقی ئـــــەم گیـــــان لەبـــــەری ڕووناکـــــە

گیانـــــە تـــــا هـــــەل هەیـــــە لـــــەو جـــــێ گـــــەورە

بـــــدە حـــــەوجاری وەکـــــو جـــــەج دەورە

لێـــــی بپـــــاڕێوە نـــــزا لـــــە خواکـــــا

بـــــا گرێـــــی کـــــاری هـــــەژاران ڕاکـــــا

مامۆســـــتا عەبـــــدوڕەحمانی شـــــەرەفکەندی

"هەژار"

## پیری مەی نۆشان

چـــەندین پیــــری ژیـــر، چـــەندین شـــۆڕە لاو

بـــــەتین و تاقـــــەت، بـــــەناوبانگ و نـــــاو

ســـــینەیان جێگـــــەی حـــــوببی مـــــەولابوو

لـــــە دونیـــا ســـارد و گـــەرمی ئـــەو لا بـــوو

وەک ســـەیید مەشـــهور "ســـەیید نـــووورانی

"موحەممـــــەد ســـادق"، "مـــــەولانای" ســـانی

ســـەیدی بـــا جەوەنـــد "رەحـــیم" نـــامی بـــوو

لـــــەناو ســـــالیکان ئیحتیرامـــــی بـــــوو

مامۆســـتا باڵـــەک قورئـــان خـــوێنی چـــاک

ســـەیید بـــەرزنجی، شـــێخی ئـــەمین پـــاک

سەردەســـتەی مەســـتان مەســـتی بـــێ بـــادە

مەلانەجمـــــــــەدین خەلیفـــــــــە زادە

"شـــێخ موحەمـــەد" یـــش دڵـــێم لـــەم رەدە

گـــولی شـــەوبۆ بـــوو ئـــەو لالـــە قـــەدە

جـــــەنابی "مـــــەلا حوســـــێن" ســـــەقزی

شـــوغلی شـــەش ســـاڵی چـــبوو؟ نـــان پـــەزی

"حـــاجی شـــێخ عـــوزا" وەلـــی خـــامۆش بـــوو

خامۆشـــی خـــۆی بـــوو کـــە فـــەراموش بـــوو

ســـەلام دەنێـــرم لـــە بـــۆ "مـــام ســـەلام"

ئەگـــەر لاییـــق بـــێ ســـەلامی غـــولام

قەلـــەم لـــە دەســـتم بـــە شـــکایەتە

دەڵێـــی هەتاکـــەی ئـــەم حیکایەتـــە

ســـەفی ســـالیکان ســـەفی بـــی حـــەدە

گـــەر تـــۆ بزانـــی یـــەکێ لـــە ســـەدە

شـــێخیان "شـــەمس" بـــوو مـــانگ و ئەســـتێرە

تـــالیبو للاکـــان کـــۆتران تـــا ئێـــرە

***

"شەمـــسەدین" جـــان بـــوو بـــە جانانـــە مەســـت

پیـــری مـــەی نۆشـــان پەیمانـــە بـــە دەســـت

رۆحـــــوڵڵاهی بـــــوو لـــــەناو ئەشـــــباحا

نـــــوور و ســـــەماوات لـــــەناو میـــــسباحا

دنیـــای ســـەر مەشـــقی دنیـــا داران بـــوو

هەوری کەرم بوو، رەحمەت باران بوو
ئاوەڵا دڵ و دەست و دەروازە
ئیمان و دینی موحەمەد تازە
ئەهل و عەیال و مرید بە پاکی
مومتازی زەمان بە چاکە و چاکی
باری دوو دنیای لەسەر شان دانا
بە تەوفیقی حەق بردی "مەولانا"
قیامەت و دنیا کاری لە پێش بوو
بە هیممەت شابوو بەدڵ دەروێش بوو

***

بۆ خۆم نەخشینم و شیعرم نەخشینە
بە بورهان ئەچم وەختی بەخشینە
عەرز و دادی خۆم هەر بە تۆ دەڵێم
ئەتۆ دەرم کەی جا بۆ کوێ هەڵێم
نەهەنگی دەریای مەوواجی تەوحید
هومێدم بە تۆ مەمکە ناهومید
رەوزەی پێغەمبەر خۆ گڵاو ناکەم
خەتا لە پێشگای ئەو بڵاو ناکەم

خـــودا پەســـەندن هـــەموو كـــاری تـــۆ
لەهـــــەر مـــــەقامێ خـــاترداری تـــــۆ
دەســـــتە و دامێـــــنم پـــــەنام هێنـــــاوە
تـــــۆ دەرم مەكـــــە قوربـــــان قـــــەوماوە
ڕیـــــسوا و ڕووســـــیيام بـــــە دڵ وا هـــــاتم
فكرێكـــــی بكـــــە بـــــۆ ڕێـــــی نـــــەجاتم
هـــــەزاری وەک مـــــن دەبـــــێ رزگـــــاری
ئەگـــــەر جـــــارێكی بـــــدوێی لـــــە كـــــاری
هەرچـــێكی كـــردم زوڵـــم و زوڵمـــەت بـــوو
هـــەلی كەســـبی خێـــر هـــەلم هەڵمـــەت بـــوو
هەرچـــێكی كـــردم، كـــردم دەگـــەڵ خـــۆم
هومێـــدی ئـــەوە كـــە مـــن ســـەروە تـــۆم
مـــەخلوق بـــە زاهیـــر مـــن بـــە دڵ بـــەدم
هـــەر خـــوا دەزانـــێ بـــەدی بـــێ حـــەدم
"میرزا ئیبراهیمی فازلی"

## خانەقا

هەر کەس بە تەمای دین و دنیا بێ
دەبێ لەو دەرکە خاکی دەرگا بێ
قیبلەیە بۆمە زۆر لە مێژ ساڵە
ڕووی لێ وەرگێڕین نوێژمان بەتاڵە
دڵ وەک ئاوێنە جەلای هەڵدێنێ
ژەنگی گوناهو ژاری نامێنێ
جێگا و خانەقای "شەمسی بورهانە"
شەیتان وەک شێتان لێی سەرگەردانە

مامۆستا "سیف القضات"

# شێخ یوسف
# شمس الدین برهانی
# در تاریخ مشاهیر کرد
## تالیف: با با مردۆخ رۆحانی

شیخ یوسف ملقب به شمس الدین، به سال ۱۳٤٥ یا ۱۲٤٦ هـ.ق در ابادی (ماوه ت) از قرای شارباژیر کردستان عراق تولد یافت. پدرش زارع بود و او در آغاز کودکی تا اوایل جوانی در کارهای کشاورزی یار و همکار پدر بود، تا جائیکه در امور روستایی بصیرت و مهارت درخوری پیدا کرد.

پس از آن بر اثر ذوق و استعداد ذاتی دنبال کسب دانش رفت و در سلک طلاب به مدارس عدیده ای راه یافت و معلومات ارزنده ای اندوخت، بعد از خاتمه تحصیل به روستای"طویله" روی نهاد و به قطب الطریقه شیخ عثمان نقشبندی گروید، پس از تمسک، ضمن انجام آداب طریقه، مدتی در خانقاه مشغول بود، تا اینکه اندک اندک مدارج عالیه را طی کردو با اخذ اجازه و احراز مقام خلافت به دستور شیخ مرشد به جانت مکری روانه شد و در آبادی "برهان" اقامت گزید، و بر تعلیم طریقه نقشبندیه و خدمت به مسلمانان از راه امر به معروف و نهی از منکر همت گماشت.

شیخ یوسف اندیشمندی نیک سیرت و عارفی ستوده سر پرت بوده است، مردم را به اطاعت خدا و انجام اوامر دینی دعوت کرده و از

ریاکاری و تظاهر و ابراز کشف و کرامات و قبول کمک مالی از مریدان و منسوبان ابا داشته است، خود شخصا در همان آبادی به کار کشاورزی پرداخته و از مردم خواسته که در این کار او را یاری کنند.
او از مالکان آبادی زمین را اجاره میکرد و به همراهی مردم به زراعت میپرداخت، و با کد یمین و عرق جبین معاش و مخارج زندگی خود و زایران و مهمانان را فراهم میآورد که این خود درسی بود برای همه مردم که آن سامان که از تنبلی و تن آسایی و زندگی اتکالی بپرهیزند و با سعی و تلاش و رعایت مقررات و آداب دینی از دسترنج خود ارتزاق کنند.
سرانجام بعد از مدتی از بهره محصول فلاحت سرمایه ای جهت خانقاه فراهم آمد که از آن روستایی به نام "شرفکند" خریداری شدو در محلی از حومه آنجا به نام "سولاوکان" خانقاهی بنا شد که شیخ بعدها آبادی دیگری را به نام "آتا بلاغی" خریداری کرد و آنرا موقوفه خانقاه کرد.
عزت نفس و همت بلند و تقوای شیخ یوسف موجب شد که مردم از هر طرف به خانقاه وی روی نهاده و خود را تسلیم تعلیم و تلقین طریقه کرده اند، حتی بسیاری از علما و ادبای طراز اول مکری و شکاک نیز سر سپرده و از مریدان او بوده اند، از قبیل :" سید محمد سعید کلیجی"، "ملا محمد وسیم" مشهور به "ملای گورومه ری"، "ملا سراج الدین شکاک"، " ملا احمد یارالی"، "سید رشید"، "ملا محمد صادق مرزینگ"، "مصباح الدیوان"، "سیف القضات مکری"، "حیدری مهابادی"،"سالار سعید"و...
انبوه مردمی که شبانه روز در خانقاه شیخ یوسف جمع شده اند شبها سرگرم تجهد و تلاوت قرآن و ذکر و فکر و ختم مرسوم طریقه بوده و روزها به کار فلاحت و امور خانقاه پرداخته اند.
شیخ یوسف بارها تاکید و توصیه کرده بود که مشیخت ارثی نیست و بعد از من هیچیک از اولاد و احفا من حق شیخت ندارند و نباید مریدان کسی را از آنان بعنوان شیخ بپذیرند و اگرچه دارای فرزندان متعدد و شایسته ای بوده،- بعد از وفات خود او هیچیک از آنها بر مسند ارشادو

مشیخت قرار نگرفت، اما خانقاه تا این اواخر همچنان دایر بوده و زوار و مستمندان از موقوفه آن پذیرایی میشده اند.

شیخ یوسف به سال ۱۳۲۸ هـ.ق وفات یافت و بر تپه بلندی در نزدیکی خانقاه به خاک سپرده شد، مقبره اش هم اکنون مطاف زائران است، این عبارت قرآنی:" واجعله رب رضیا" به حساب ابجد برابر با سال وفات شیخ یوسف است.

**مستفا از یادداشت استاد شرفکندی"هه ژار"**
**یادی مه ردان، به رگی دوم**

## من و دیوانی

## حەریق

من هەر لە منداڵییەوە سەودا سەر و شەیدای شیعرە بەرز و جوان و ئاگراوییەکانی "حەریق" بووم ئارەزووم دەکرد ڕۆژێك بتوانم باسێك لەسەر ژیان و شیعرەکانی بنووسم و پێشکەش بە مێژووی ئەدەبی کوردی بکەم.

لە سەرەتای ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی کە نیاز هاتە سەر لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسین و کۆکردنەوەی سەرجەمی شیعرەکانی "حەریق" کاتی خۆی دیوانێکی دەستخەتی شیعرەکانی، بە خەتێکی زۆرخۆش کە وەك دەڵێن دەست خەتی خۆش نووسی نێو بە دەرەوە خوالێخۆشبوو میرزا "مەحمودی شا بەندەر"ی مەهابادییە، کەوتبووە دەست دۆستی بەڕێزم جەنابی کاك دەروێش محەمەدی کوڕی خوالێخۆشبوو حاجی شێخ عەبدوڵڵای شەمسەدینی وە بۆ ئەو مەبەستە لە هاوینی هەمان ساڵدا چەند جارێك ویستم ئەو دیوانە دەستخەتەم چنگ بکەوێ، چون ئەو دیوانە سەرچاوەیەکی زۆرباش بوو بۆ ئەوەی بە ئیتمینان و دڵنیاییەوە لەبەر ڕووناکیدا دیوانێکی ڕێکوپێك و چاکی لەبەر بنووسرێتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ زۆر بە پەرۆش بووم بۆ هێنانەدی ئەو ئاواتە بەرز و گەورەیەم، کە نەك تەنیا هەر ئاواتی من بوو، بەڵکو ئارەزووی هەزاران کەسی دیکەش بوو کە پێیان خۆش بوو ڕۆژێك لە ڕۆژان زووتر دیوانەکەی مامۆستا مەلا ساڵحی "حەریق" بکەوێتە دەست خەڵك و بڵاوبێتەوە، ئەوە بوو ڕۆژ بە ڕۆژ پتر هەست و ویژدان و ئارەزووی دڵم هانی

دەدام و پاڵی پێوە دەنام بە ڕاپەڕاندنی ئـەو ئەرکـە بـە نـرخ و پـیرۆزە بـەوەی کـە دەبـێ دیوانەکەی لە فەوتان و لەناوچوون رزگار بکەم و بە چاپی بگەیەنم، بەختەوەرانە بـەختم یاربوو وە ئەو ئاواتەم بەدی هات و دۆستی بەڕێز جەنابی کاك "دەرویـش محەمـەد" لـەو ڕووەوە زۆر دڵسۆزانە و بە سـەخاوەتێکی تـەواوەوە دەسـتی یارمـەتی بـۆ درێـژ کـردم و دەستنووسەکەی میرزا "مەحمودی شابەندەر"ی بۆ هێنام، بێجگە لەو دەستخەتەی کە بـە نەسـڵ دامـنا سوودم لە چەند بەیاز و کەشکۆڵ و دەستنووسی دیکـەش وەرگرتـووە و وەك سەرچاوە پشتم پێ بەستوون و شیعرم لێوەرگرتوون.

ئەمجارە کەوتمە پشکنینی ئەو کتێب و گۆوار و نووسراوانەی کە شیعر و بە سەرهاتی ژیانی حەریقیان تێدا بڵاوکراوەتەوە، زۆربەی ئەو دیوانەم لەبەر ڕووناکـایی شـیعری نێـو کەشکۆڵ و بەیازە کۆنەکان و بەتایبەت چەند دیوانی دەستخەتدا نووسیوەتەوە، کـە دوای لێکۆڵینەوە و گـەڕانێکی پـشوودرێژ و زۆر و بـەراوردکردنیان لەگـەڵ دیوانـە بـچووکە بڵاوکراوەکەی، ئەو دیوانەم دوای چەند ساڵ کارکردن و لێکۆڵـینەوە و توێژینەوە پێکهێنا و ئامادەم کرد. بە داخەوە لە کاتی خۆیدا مەلا سـاڵحی "حـەریق" نـە خـۆی و نـە کـە سێکی دی شیعرەکانی کۆنەکردوەتەوە، بەڵکو هەر شیعرەی کەوتۆتە لای یەکێك و یا لـە پشتی کتێبێك و بەیازێك و دەفتەرێك و لاپەڕە کاغەزێکدا نووسراوە، هەروەها "حـەریق" لە وەختی خۆیدا سەردێڕ و سەرباسی بۆ هۆنراوەکـانی خۆیـدا نـەناوە و مـن خـۆم دوای خوێندنەوە و تێگەیشتن لە ناوەڕۆك و مەبەستی هۆنراوەکـان و دەرکـەوتنی مەبەسـتەکە نێو و سەردێرم بۆ داناون، ئەوەی شایانی باس بێ ئەوەیە زۆربەی ئەو شیعر و بەیازانە بـە خەتی نەستە علیق و خەتی شکەستەی فارسی کۆن نووسراون و منیش بە پێـی توانـای خۆم هەموویانم گۆڕیوەتە سەر شێوە و ڕێنووسی کوردی ئەمڕۆ، بە پێی تواناش چـامە و غەزەل و چوارینە و تاکەکان و بەشی ئـایینی و عیرفـانی و فەلـسەفە و کۆمەڵایـەتی و

بەهار و سروشت و شین و لاواندنەوە و هەموو جۆریشم جودا کردۆتەوە بۆ ئەوەی خوێنەری خۆشەویست زیاتر تام و چێژی لێ وەرگرێ.

بەو جۆرە دوای تێکۆشانێکی چەند ساڵەو زۆر، توانیم ئەو دیوانە بەو شێوەیە بخەمە بەردەستی خوێندەوارانی خۆشەویست و بەڕێز، هیوادارم دیوانەکەی "حەریق" جێی خۆی لە دڵیاندا بکاتەوە و منیش بەو کارە چکۆلەیەم خزمەتێکی وێژە و ئەدەبی کوردیم کردبێت.

## ناوی کەسان

**ئەبولوەفا:** خوالێخۆشبوو حاجی شێخ عەبدورەحمانی کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدینە، لە وەرزی بەهار لە پێنجی موحەڕەمی ١٢٥٣ کۆچی لە دایکبووە و لەساڵی ١٢٨٥ لە دنیا دەرچووە، ئەو زاتە لەنێو چوار کوڕە نێرشاد کەرەکەی شێخ عوسمان سیراجەدیندا کوڕی دووهەمیانە، حاجی شێخ عەبدورەحمان شاعیر و ئەدیبێکی ناسک خەیاڵ و پایەبەرزی چەرخی خۆی بووە و دیوانێکی شیعری بە فارسی لەپاش بە جێماوە و بە شێکی چاپکراوە.

**"ئەدەب"** : نازناوی شاعیری گەورەو پایە بەرزی کورد عەبدوڵلا بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی برایم بەگی ڕۆستەم بەگی کوڕی سەیفەدینە، لە ساڵی ١٨٥٩ زایینی لە گوندی "ئەرمەنی بلاغی" هاتۆتە دونیاوە، وە لە ساڵی ١٩١٦ لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا دونیای بەجێهێشتووە..

**سیراجەدین:** نیاز لە حەزرەتی شێخ عوسمانی کوڕی خالید ئاغای کوڕی عەبدوڵلا ئاغای کوڕی سەیید محەمەدی کوڕی سەیید دەروێشە، لە ساڵی ١١٩٥ کۆچی لە ئاوایی

"تەوێڵە" لە قەزای هەڵەبجە هاتۆتە دونیاوە و لە شەوی سێشەممەی سێزدەی شەشەلآنی ١٢٨٣ لە تەمەنی هەشتا و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە داوێنی دێی "تەوێڵە"وە نزیك بەو خانەقایە کە خۆی دروستی کردووە بە خاك سپێراوە.

**سەیید ڕەشید** : زانا و هونەری بە هەست و قسەخۆشی بەناوبانگ لە هۆنراوەیەکدا کە لە تاریفی "شێخی بوران" دا گوتویەتی نازناوی "چاوەش" بووە و لە شیعری تریشدا نازناوی "شەهیدی" بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

**"سەیفول قوززات"**: شاعیری زانا و بەهرەوەری کورد مامۆستا مەلا حەسەنی سەیفول قوززات لە ساڵی ١٢٥٥ هەتاوی لە شاری "مەهاباد" هاتۆتە دنیاوە، کوڕی زانا و پێشەوای ئایینی ناوچەی "مەهاباد" میرزا قاسمی قازی یە و لە ڕۆژی حەوتەمی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٣ هەتاوی دا کۆچی دوایی کردووە و لە خانەقای "شێخی بورهان" بە خاك سپێردراوە.

**فەخرول عولەما**: مەبەست حاجی مەلا محەمەد سەعیدی تەوحیدی کوڕی خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی تەوحیدی سورنجداغی و برای بچووکتری مەلا ساڵحی سەدرول عولەمایە، لە ساڵی ١٢٤١ هەتاوی لە شاری "مەهاباد" هاتۆتە دونیاوە، لە ساڵی ١٣١٨ کۆچی مانگی لەلایەن "ولیعهدالملك"دوە لەقەبی سەدرول عولەمای دراوەتێ و زانایەکی پایەبەرز و ئایینپەروەر بووە و چەندین ساڵ لە مزگەوتەکانی "حاجی ئەحمەد" و "عەباس ئاغا" "حاجی سەیید پاییز"ی مەهاباد مامۆستای ئایینی و مودەڕریس بووە و چەند ساڵێکیش ڕەئیسی ئەوقاف و بەڕێوەبەری سولحییە بووە هەر لەو شارەدا، تاکو لە ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی هەر شاری "مەهاباد" کۆچی دوایی کردووە.

**زیبائەددین**: لە قەبی حەزرەتی شێخ عومەری بیارە و کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدینە، لە شەوی دووشەممەی بیست و شەشەمی جومادەل ئولای ١٢٥٥دا لە دێی

بیاره لە دایکبووه و لە شەوی دووشەممەی شووالی ١٣١٨دا کۆچی دوایی کردووه، شاعیر نووسەرێکی گەورە بووه و گەلێك شیعر و پەخشانی بەرزی لەپاش بەجێماوه و نازناوی لە هۆنراوه هۆنینەوەدا "فەوزی" بووه .

**حاجی با بەشێخ:** حاجی "سەیید بابە شێخ"ی سەیادەت زانای پایەبەرزی شاعی و ئایینپەروەری کورد کوڕی خوالێخۆشبوو قوتبول عارفین حەزرەتی سەیید عەبدولکەریمی زەنبیلە و لە ساڵی ١٢٦٤ هەتاوی چاوی بە ڕووناکایی ژیان پشکوتووه و لە ١٣٣٨/٧/٣٠ هەتاوی لە ئاوایی تورجان کۆچی دوایی کردووه و بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کردووه.

**مەولانا:** مەبەست لە مەولانا محەممەد سلاقی وانی سۆفی و خەلیفە و جێنیشینی خوالێخۆشبوو "شێخی بورهان" بووه، مەولانا محەممەد سادق لە زانستەکانی ئایینی و خوێندنی قورئانی پیرۆزدا زۆر شارەزا و چازان و کارامە بووه و سەرپەرشتیکەری کاروباری خانەقا و ئەوقافی خانەقا بووه، بە ئیشوکاری شەریعەت و تەریقەتیش ڕاگەیشتووه و تۆبە و تەلقینی مرید و مەنسوب و سۆفیەکانی دەدا وە هەموو ڕۆژێ دەرسی قورئانی بە تەجوید و تەفسیرەوە بە شاگردەکانی گوتووه و دەوری پێ کردوونەوه و چەندین هەزار کەس لە خزمەت ئەم مامۆستا زانا و دینپەروەرەدا فێری قورئان خوێندن بوون، مەولانا خاڵی باوکی مامۆستا "هەژار" شاعیری زانا و ناوداری کوردە و پردی "قەرەقشلاغ" و "قەلاتاسیان" و "ڕێگەی بەسری" ئەو دروستی کردووه.

**میرزا لەتیفی قازی:** کوڕی میرزا ئەحمەدی کوڕی میرزا مەحمودی کوڕی خوالێخۆشبوو قازی لەتیفە، پیاوێکی زانا و زیرەك و بە هۆش بووه و لە دێیی "گردی یاقوب"ی ناوچەی شاروێرانی "سابلاغ" قازی شەرع بووه، لە جەنگی یەکەمی جیهانیی لەگەڵ خوالێخۆشبووان قازی "مونعیم" و "سالاری میرزا فەتاح" بە دەستی سەربازەکانی

ڕووسی بە دیل گیراوە و بردوویانە بۆ وڵاتی ڕووسیا و ماوەی حەوت ساڵ لە یەکێك لە شارەکانی ئەم وڵاتە زیندانی بووە و لە پاشان لە ساڵی ١٣٤٠کۆچی مانگی لە شاری "مەهاباد" شەهید کراوە و میرزا کەریمی کوڕی تەرمەکەی بردۆتەوە بۆ خانەقای شێخی. بورهان و لەوێ بە خاکیان سپاردووە.

**مەلا ئەحمەدی لاسوور:** خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی ڕەبانی کوڕی مەلا خوسرەوە و لە ساڵی ١٢٨٥ مانگی لە گوندی "پیر یوسف" لە دایکبووە و یەکێك لە مەلا زاناکانی ناوچەی موکریان بووە و بە مەلای لاسوور ناوبانگی دەرکردووە و کۆبە و پەراوێزی لەسەر زۆر کتێب هەیە و زانایەکی قسەخۆش و حازر جەواب بووە و لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا لە ١٣٥٩ی مانگی لە دێی "مەرخوز"ی ناوچەی بۆکان کۆچی دوایی کردووە.

**شێخ ئەحمەد:** مەبەست لە شێخ ئەحمەد کوڕی پێنجەمی خوالێخۆشبوو شێخی بورهانە.

**نووراني: مەبەست لە "نوراني" حاجی سەیید محەمەد سەعیدی کولیجی عاریف و خواناسی زانا و شاعیری ناسك خەیاڵی کوردە و مامی دایکی شاعیری بەهرەمەندی کورد مامۆستا "هەژارە".**

## ڕێز و سوپاس

لە پێوەندی لەگەڵ ئەو دیوانەدا بەر لە هەموو شتێك دەمەوێ لە خوای گەورە و بێ وێنە بپاڕێمەوە ڕەحمەتی بێ سنوور و بێ پایانی خۆی برێژێ بەسەر گڵکۆی مامۆستایانی زانا و ئایینپەروەری کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای مودەرریسی مەلا و مودەرریس و پێشنوێژی مزگەوتی "ڕۆستەم بەگ"ی مەهاباد و مەرحومی مامۆستا حاجی مەلا ئەحمەدی وەلـزی مەلا و پێشنوێژ و دەرس وێـژی مزگەوتی "مەولەوی" مەهاباد کە بە سەخاوەتێکی ئەوا و لە پێکهێنان و ئامادەکردنی ئەو دیوانەدا یارمەتی یان دام و ڕێنوێنی یان کردم، خوا لێیان خۆش بێت و گیانی پاکیان بە بەهەشتی بەرین شاد بکا و هەزار دروود و سڵاو لە مەزاریان بێت.

هەروەها لە قوڵایی دڵەوە سوپاسی دۆستانی بەڕێز جەنابی مامۆستا مەلا ئیسماعیلی شەمسەدینی و کاك مەلا "ئەبوبەکری سپێهرەدین" دەکەم کە لە نووسینی ژیاننامە و بەسەرهاتی خوالێخۆشبوو "شێخی بورهان"دا یارمەتییان دام.

هیوای سەرکەوتن و بەختەوەری و تەمەن درێژی بۆ دۆستی زۆر خۆشەویست و نیگارکێشی بەهرەمەند و کەم وێنەی کاك محەمەدی کەریمی ئاڵبلاغی دەکەم کە وێنەیەکی حەریقی بۆ ئەم دیوانە بۆ کێشام، بەڵام بەداخەوە نەمانتوانی چاپی بکەین.

لە خوای گەورە داوا دەکەم کە وێنەی ئەم جۆرە کەسانە بۆ خزمەتکردن بە وێژە و ئەدەبی کوردی پتر بکا.

بسم الله الرحمن الرحيم

## خەوف و رەجا

خــۆفم لــە خــودا، چــونکە لەبــەر غــەیری خودایــە

ئــەمنم بــە درۆ، ســورەتی وەک خــۆف و ڕجایــە

پــاڵی ڕەحــەتی داوەتــەوە نەفــسی خەسیــسم

یــا ئــەمنی غــەنا، یــا ئەســەری یــەئس و هەوایــە

گــەر تــالبی بــوو "یۆســفی" خــۆت نەفــسی عــەجوزە

زوبێنــە، دە زوبێنــە دەڵــێن ئــەهلی وەفایــە

ئینکــاری ســیرایەت مەکــە، ئــەی مــەنکیری مــوفلیس

بــێ ســەیری قەمــەر کــە چ بــە شــۆق و بەزییایــە

مــونکیر بــە مەســەل شــەبپەڕە بــێ نــووری هیدایــەت

خــۆی تــالبی زوڵمــەت بــوو خــودا نــووری نەدایــە

هــەر مەزبەڵــە، هــەر مەشعەلە، جێــی پــڕ تــەوی "شەمسە"

یــەک جێگــەیی فــوز لــە، یــەکێ جێگــەی فوزەڵایــە

تێفکــرە لــە ئــەجزایی عەناســیر بــە تەبیعــەت

یـــەک مـــاییلی مەرکـــەز، یـــەکێ ماییـــل بـــە هەوایـــە
بـــارانی بـــە ڕەحمـــەت لـــە تـــەرف مەبـــدەئی فـــەییاز
قـــەترێ ئەســـەری ســـونبول و یـــەک چـــقڵ و گییایـــە
نوقـــصان لـــە تـــەرەف قابیلـــە، نـــەک فـــاعیلی کامیـــل
ئـــەم قـــەولی منـــە رەئیـــی جـــەمیعی حوکەمایـــە
بورهانـــە لەســـەر جـــەهلی عـــەدو "شەمـــسی" حەقیقـــەت
تـــالیع بـــووە، ئـــەو ئەحمەقـــە جۆیـــایی چـــرایە
چـــاوی بـــە تەمـــەع پڕبـــووە، قـــەلبی بـــە حەســـادەت
وەک تـــەبعی بـــەهاییم رەحـــەتی هـــەر لـــە شـــەوایە
هێنـــدوو نییـــە ئـــایینی لـــە ئاوێنـــە تـــەعن دا
ئاوێنـــە چ سووچـــی هەیـــە ئـــەو ڕوویـــی ســـیبیایە؟
پەروانـــەیی هـــەر جـــەمعێ نـــەبی چـــاکە "حـــەریقی"
خـــۆت بێنـــەرە نێـــو زومرەیـــی ئـــەم شەمـــسی هودایـــە

***

## نووری موحەمەد

بەو نوورە کە زاهیر بوو لەسەر ڕوویی موحەمەد
عالەم هەموو ئاشوفتە بوو وەک موویی موحەمەد

مەخجول و سەر ئەفکەندەیە نەسرین و وەنەوشە
بۆ موویی سەمەد بۆیی دووگێسویی موحەمەد

مەجزو بە هەمو کەس بەڕە موزو بە ئیشارە
مەجبورە لە دەس ساعید و بازویی موحەمەد

سەروی چەمەنیش پێی لە گڵ و خاری غەمایە
لەرزانە لە حەسرەت قەدی دڵجویی موحەمەد

لالەش وەکو من سینەیی پڕ حەسرەت و داخە
تا دیویەتی ڕوخسارەیی گوڵ بۆیی موحەمەد

"بورهانە" لەسەر نەفیی مونافاتی شەو و ڕۆژ
مووێی کە پەرێشانە لەسەر ڕوویی موحەمەد

عالەم وەکو من جەرگی بڕاوە بە نیگاهو
ڕەم کردن و ئیستا دەنی ئاهویی موحەمەد

ڕۆح و دڵ و دینت هەیە هەرسێکی "حەریقی"
سەرفی کە لە ڕێی وەسف و سەنا جۆیی موحەمەد

***

## ئاگری دووری

نـــەما ئـــاوی بـــەقا بـــادی فـــەنا خـــاکی بـــە بـــاداوم

کـــە یـــارم ئـــاگری دووری لـــە پێـــستی جەســـتە بـــەرداوم

بـــە قوربانـــت بـــم ئـــەی ســـاقی بـــدە پـــێم ڕاحـــەتی ڕۆحـــم

بـــەبێ ئـــاوی حـــەیاتی تـــۆ جگـــەر ســـوتاو و بـــرژاوم

بـــە شـــەوقی شەوچـــرای کوڵمـــت فریـــوت دا کـــە مـــورغی دڵ

بـــە شـــێوەی زوڵفەکـــەت زانـــیم کـــە مـــن گیرۆدەیـــی داوم

کە دیتم شـەمعی روخـسارت بـە پەروانـەی دڵـی خـۆم کـوت

لەنێوچـــاوانی خـــۆم نووســـیوە هـــەر بـــەو شـــەمعە ســـوتاوم

تەماشـــای چـــاوەکەم کـــردی بـــرۆت فـــەرموی ئـــەمن تـــاقم

بـــە شـــۆخی زوڵفـــی لاولاوت دەوێـــژێ هـــەر ئـــەمن لاوم

دەڵـــێن وا جێـــژنی نـــەورۆزە، دڵـــم پـــڕ ئاتـــەش و ســـۆزە

وەرە بـــۆ جێژنـــە پیـــرۆزە بـــدەم ڕۆحـــم، بەسەرچـــاوم

وەرە سەرچـــاوەیی چـــاوم دەڵـــێ دەریـــایی عەممانـــە

تەماشـــای ئەشـــکی گوڵنـــارم لـــە ســـایەی چـــاوی خوێنـــاوم

هەمو کـەس مەسـتی بـادەی کـەیف و شـەوقی بـەزمی جانانـە

بــه تــەنیا هــەر ئــەمن ئــەمڕۆ لــە خــاکی مەینــەتا مــاوم

تەماشــای چــاوی نێــرگس کــە بــە مەســتووری چ مــەخمووره

تەماشـــای پێکـــەنینی گـــوڵ بـــە ئـــەحواڵی پەشـــێواوم

دییـــارە ســـاقی بـــێ بـــاقی، نییـــە مـــەیلی بـــە دڵـــداری

دەڵـــێم هـــا نەقـــدی جـــان و دڵ، دەڵـــێ لاچـــۆ لەبـــەر چـــاوم

دەوای هیجرانی گوڵ ئـەی دڵ لـە "شـێخ ئەحمـەد" تەمەنناکـە

بڵـــێ ئـــەمڕۆ بـــە ناحـــەق نەونـــەمامی جـــەرگی پێکـــاوم

حـــەقم بـــستێنە ئـــەی نـــەخلی مـــراد و ســـەروی ئـــازادم

وەکـــو عـــارەب دەخیلـــت بـــم زەلیـــل و زار و دامـــاوم

"حـــەریقی" نـــاری هیجـــران و غـــەریقی ئەشـــکی حیرمـــانم

لـــە خـــاک و بـــادی عالـــەم دا ئەنیـــسی ئاگروتـــاوم

***

## تاوی گریان

لــه ئــەم عیــدە بەعیــدم مــن لــە دیــداری رەفیقــانم
خــودا ســا تــۆ قــەریبم کــەی لــە خــوانی وەسـڵی یـارانم
لــەلایێ عیــشرەت و شــادی، لــەلایێ گــەردن ئــازادی
ئــەمن کەووتومــە نێــو داوی حــەریقی نــاری هیجــرانم
ســەرم قوربانــت ئــەی کــە تــۆ ســا دەی، وەرە، ســا، دەی
فیـداتم دەسـت و بـردێ کـە ئەجـەل نـەک بـێ بـە میـوانم
دڵــم کەوتۆتــە زوڵمــات و دەڵــێ پــێم خۆشــە تــاریکی
بــە تــاریکی ســەری زوڵفــت هومێــدم مــاوە وەبــزانم
خبـودا عــومرت بــدا بــاقی، وەرە ســاقی بــدە ڕاقــی
کــە تــۆ هــەمرازمی مــەی بێنــە بــۆ دەرمــانی دەردانــم
هــەتا کــوفری ســەری زوڵفــت ببیــنم وا لــەنێو کــوفرام
کـە دیـتم شـەمعی ڕوخـسارت دەڵـێم ئۆخـەی موسـوڵمانم
بە ڕەنگی ئەشـکی خـوێنینم کـە ڕووسـوورم لـە قـاپی حـەق
لــە فــەیزی تۆوەیــە ســاقی بەجۆشــە تــاوی گریــانم
بــە خوێنــاوی دڵــی زارم وەرە کــاکۆڵ حــەنایی کــە

مـــەڵێ راوەســـتە تـــا قوربـــان، لـــە عیـــدەینا بـــەقوربانم

لـــەنێو ئاتەشـــکەدەی غەمـــدا کـــەبابی دڵ ئـــەوا بـــرژا

شـــەراب بێنـــە بـــە پەیمانـــە تـــەواوە عەهـــدو پـــەیمانم

شـکور وەسـڵم هەیـە ئـەمڕۆ لەگـەڵ پـەیکان و تیغـی تـۆ

کـە کوشـتەی تیـری موژگـانم، کـە چـاکی تیغـی حیرمـانم

کوتـــت دانـــەی خـــەیاڵت بێنـــەرە نێـــو داوی زوڵفـــەینم

ئەگـــەر دەیکـــەم پەرێـــشانم، ئەگـــەر نەیکـــەم پەشـــیمانم

سەفی تـابووری موژگانـت لـە قەلعـەی دڵ کـە جێگیـر بـوو

هـــەتیوی دڵ نەماجێگـــەی، لـــە بـــۆ کـــوێ روێـــی نـــازانم

"حەریقی" تـەرکی یـار ناکـەم سـەرم ببـڕن ئەگـەر فـەرزەن

نییـــە بـــاکم لەبـــەر تەعنـــەی مریـــدی پیـــری رەنـــدانم

***

## گوڵی شادی

بــۆ جــەمعی غــەم و شــادی نــەبوو ڕۆژی محــەڕڕەم
ڕووت بــەرگی گــوڵی شــادی و زوڵفــت شــەوی ماتــەم
بــەو وەجهــە دەڵــێن مەسحەف و بــەو نوقتــە دەڵــێن دەم
بــەو زوڵفـــە دەڵــێن قەیــد و بــەو حاشــییە پەرچــەم
تەفــسیری شـــەوی وەســڵ و غـــەمی ڕۆژی فیراقـــە
مەشــهوورە لــە دنیــا بــە بەهەشــت و بــە جەهەنــەم
تەقــسیمی ئــەزەل وابــوو لــە دواییــدا مــن و یــارم
بــۆ ســەیری ئــەمن ســەید و ڕەقیــب کــەلبی موعەللــەم
تەســبیحی ســەنای زوڵفــی خەیاتــە و لــەبی مــەرجان
ســەر ڕیــشتەیی ئێمــەی دەوێ بــۆ عیقــدی مونــەززەم
شــادی ئەســەری مەســتییە بــێ شــەرت و وەفایــە
بــۆ فرســەتی تەنگانــە غەمــە مــونیس و مــەحرەم
عــومرێ کــە ئەساســی هەوەســی بــازی نــەفس بــێ
قابیــل نییــە بــۆ خێــوی شــادی و ئەلــەم و غــەم
بــێ ســێبەر و ســەبر و گــڕە شــەوقێکە مــودارا
نــەم دیــوە لــە گــەرما و لــە ســەرما دڵــی خــوڕڕەم
بــۆ دڵبــەری مــەعنی لــە حەرەمخانــەیی ئەســرار
خــۆی و قەڵــەمی مــاوە حــەریق ئێــستە بــە مــەحرەم

***

## هەوری خەفەت

هـــەوری خەفەتـــە بـــەفری غـــەمی داوە بـــە ســـەرما

یـــا ســـەڕ ســـەڕی دووریتـــە کـــەلێی کردمـــە ســـەرما

گاهـــێ بـــە شـــەرارەی غـــەم و گـــەه ســـەڕ ســـەڕی هیجـــران

خۆشـــی نـــەبوو بـــۆ مـــن نـــە بـــە گـــەرما نـــە بـــە ســـەرما

کەوتۆتـــە ســـەرم ئەشـــک و غوبـــاری ئەلـــەمی دڵ

یـــەعنی: کـــە قـــوڕی میحنەتـــە کردوومـــە بـــە ســـەرما

گـــەر دەچـــمەوە "ساحێب" نییـــە هـــیچ مـــونیس و ساحێب

گـــەر دەچـــمە"ســـەقز" نـــاری ســـەقەر وا لـــە جگـــەرما

شـــاهیدمە حەواســـم کەســـەکەم چـــەندە کەساســـم

بـــە خـــودا نییـــە غیـــرەت لـــە خـــەیاڵ و لـــە نـــەزەرما

هەرچـــەندە بـــە جیـــسمانی کـــە دوورم لـــە حـــوزورت

ڕۆحانییـــەتت ســـەبتە لـــە نێـــو دیـــدەیی تـــەرما

تۆفـــانی سرشـــکم چـــووە ســـەر "جـــودی" وجـــودم

کەشـــتی تـــەنی قـــوم کـــردوو نـــە نـــوح و نـــە ئەســـەرما

لەوساوە کە تۆ ڕۆیی دڵم ڕۆیی بە دوتا

هێلانەیی تەن هەروەکو مەئوایی سەقەرما

بێ فەوجی وەفاکەت کە جەفایە، وەرە ئەمشەو

ئەم لەشکری ئاهی منە بێ فەتح و زەفەرما

لەم قەسوەتەدا تاوەکو پەردەیی زوڵمەت

بەرچاوی دڵم بگرێ، دەسا بێ بە گوزەرما

ئاوێنەیی دڵ ژەنگی قەساوەت روخی پۆشی

خاکستەری دڵ سوختەیێ بێنە بە سەرما

مەنوارە بە زاهیر کە بەبێ قووتم و ڕووتم

ڕووتوقووت و خەیاڵت غەزەلی چاکە لە بەرما

سەرمایەتی ئەم مڵکی خەیالاتە "حەریقی"

حەیفێ کە تەلەف بوو، بەهەدەرچوو، بە زەرەرما

***

## گوڵی گوڵشەن

چاوەکەم ئەمڕۆ لـە گوڵـشەن گـوڵ بـە عیـشوە خـۆی نوانـد

نەک نمەک گیربم، بە مـەرگی تـۆ قەسـەم هـیچ نـەم دوانـد

گــوڵ بـــە تـــۆزی پێتـــەوە لاف و گـــەزافی لـــێ ئـــەدا

واشــکور ســۆزەی نەســیمت هــات ئەویــشی لــێ ســتاند

نەشـــتەری موژگـــانی تـــۆ هاتۆتـــە سەرســـەفحەی دڵـــم

هەر خـەتێ بـوو غـەیری خـەتتی سـەوزی تـۆ پـاکی کرانـد

لەشــکری ئــاهم لەگــەڵ جەیــشی حەبــەش دەعــوا دەکــا

حیـــرەتم مـــاوە کـــە چـــۆن ئـــەو دلبـــەرە دڵمـــی ڕفانـــد؟

بـــۆ گـــوڵی ڕووت ماتـــەمی پەرچـــەم دەبینـــی بۆیـــە وا

مـاهی نـەورۆزم بـە شـیوەن وەک محـەڕڕەم خـۆی نوانـد

تــۆ لــە ئــەووەڵ گــۆی وەفــات هێنایــە نێــو مەیدانــەوە

ئێـستە چـەوگانی خیلافـت، پـشتی سـەد وەعـدەی شـکاند

تــۆ خــودا قــەت غیرەتــە بــۆ تــۆ ئــەرێ ســەروی رەوان

گــوڵ بــەبێ تــۆ وا لــە باغــا خێــوەتی خــۆی لــێ چــەقاند؟

بـــا وجـــود ئینـــساف بـــدەم چـــاکە گـــوڵیش موشـــتاقتە
هـــەر لـــە شـــەوقی تۆیـــە ســـەرپۆش و گریبـــانی دڕانـــد
هەرکەســـێ مایيـــل بـــە پیرێکـــە و تـــەریقێکی هەیـــە
تـــۆ بـــە شـــوعلەی غـــەم حـــەریقی وا وەجاخـــت هەڵگڕانـــد

***

## فەڕشی غەزەل

ئـــەی دڵ وەرە شـــادی کـــە لـــە بـــۆ بـــەزمی ویـــسالت

وا دیومەتـــــەوە دڵبەرەکـــــەی تـــــازە نیهالـــــت

موددێکـــە کـــە ئـــەی بولبـــولی گۆشـــەی قەفەســـی غـــەم

فەسـڵت بـووە لـەم گـوڵ بـە دەمـەی نەوخـەت و خاڵـت

خـــامۆش و نمـــەدپۆش و موجـــەڕڕەد لـــە عـــەلاییق

نـــەم بیـــستووە ئـــاوازی دەمـــی تفڵـــی مـــەقالت

سـا، هەڵـسە لـە شـوکرانەیی ئـەم موژدەیـە ئـەی دڵ

ئامادەکـــە ئەســـبابی تـــەرەب ویـــسعەتی حاڵـــت

فەرشـــی غـــەزەلت راخـــە لـــەنێو حـــوجرەیی دڵـــدا

"فـــەخرول عولـــەما" بێنـــەرە دیـــوانی خـــەیاڵت

بـــۆ پێـــشکەشی رێـــی عەدبکـــە ئەوســـافی جـــەمیلی

خـــەرجی کـــە لـــە رێـــی دەعـــوەتی ئـــەودا ســـەر و ماڵـــت

حـــەددم چـــییە عـــەددی بکـــەم ئەوســـافی جـــەمیلی

مردوت مریٚ کرماجی لە بۆ عەقلٚ و کەماڵت

زاتیٚکە موبەڕڕایە لە ئەنواعی نەقائیس

ئیتر چ دەڵیٚی دەرحەقی مەفقودە مەجالت

پیٚی بیٚژە لە بۆ شەوکەتی تۆ فەخری زەمانە

پا بووستە ئەرز و فەلەکیش چەتری جەلالت

شایستەیی شانت کە "رەئیسول عولەمایە"

ریٚم ناکەویٚ حەددم نییە تەعدادی خیسالت

تا رۆژی قییامەت لە جەلالابیٚ جەلالت

نەیبینی ئیلاهی چ بەشەر رۆژی زەوالت

پەروازی نییە بولبولی دڵ بۆ تەڕەفی گوڵ

تا دیویەتی پەروانە سیفەت شەمعی جەمالت

مەقبوڵە لەلای فەخری زەمان شیعری "حەریقی"

چت پیٚ هەیە ئەی موددەعی بیٚ بیکە سوئالت

***

## جێژنانەی ڕۆح

قوربان وەرە قوربانە، سا بمکە بە قوربانت

ڕەنگین کە بە خوێناوە کاکۆڵی پەرێشانت

ئازادییە ئەم ڕۆژە، سا فەرموو بە ئازانە

تیرت لە کەمانت خە بۆ قەتڵی شەهیدانت

جێژنانەیی مە ڕۆخە کردوومە بە قوربانت

تۆش ماچێ کەرەم فەموو لەو سێوی زەنەخدانت

تفڵی دڵی بێچارە موددیکە گرفتارە

غەمخواری دڵ ئازارە بۆ ناوکی موژگانت

ڕۆح و دڵ و دین هەرسێ مەجمووع بەیەک دەفعە

قوربانی سەعاتێکی لەعلی لەبی مەرجانت

مەقسودی من ئیزهارە بۆ ئەمسیلەیی مەدحت

بۆ توحفەیی ئەوسافی ئەزهاری گوڵستانت

ئەی خوسرەوی پەروێزم، شیرینی شەکەرڕێژم

فەرهادی دڵی کوشتم چاوی ڕەشی فەتانت

موکین نییە تەقسیم و زەربی عەدەدی زەخمت

مینهاکە لە تەقسیمدا، زەربی خەمی چەوگانت

دڵ تالبی ڕوخسارت، جان تالبی گوفتارت

فرزەندی خیرەد ڕۆیی بۆ لەعلی بەدەخشانت

بۆستانە کەناری دڵ بۆ نەخلی قەدت قوربان

دیدەم وەکو ڕوبارە بۆ سەروی خەرامانت

قەلعەی دڵەکەم قوربان نیشانەیە بۆ تیرت

سینەم وەکو سەحرایە، بۆ جلوەیی مەیدانت

بۆو چاوە کەوا مەستە، دڵ سستە سەرم مەستە

ئەم ئەبرۆوە پەیوەستە، بۆ قەتڵی موحیببانت

تەنها کە حەریقم من بۆ شەمعی شەبوستانت

مەمکووژە وەرە تۆ خوا، سا تۆبە ڕەقیبانت

***

## کەوای غەزەل

هـەموو کـەس بـا بزانـێ مـن کـە سـەودای زوڵفـی دوتـاتم
لـە خانـەی کـوڵم داکـۆڵم بـە فـەرزی شـای روخـت مـاتم
ئەگەرچی ساکینی مڵکی عەجـەم بـووم دوور لـە ڕۆم کـەوتم
لـــە ســایەی پەرچـــەمی تــۆوە رەئیـــسی مڵکـــی شــاماتم
دڵـم هـەروەک رەعییـەت خـۆش نـشینی مڵکـی ئەعزاتـە
لەهـــەرجێ دا دەنیـــشێ لێـــی گـــەرێ قوربـــانی بـــالأتم
موتالای حاشییەی زوڵفت لەسـەر سـەفحەی روخـت سـەعبە
لـە بـۆم چـا بـوو بـە منـداڵی لـە دەرسـی عیـشقی ڕاهـاتم
ئەگـــەر ڕاســـتت دەوێ ســـەروی بڵنـــد بـــالا درۆ ناکـــەم
لـــەپاش فـــەوتی حەیاتیـــشم بـــە ئومێـــدی مولاقـــاتم
نـەوای ناڵـەی حـەزینم ڕاسـتە وەک قافڵـەی حیجـازی دێ
وەرە سـەر سـەیری بـەزم و سـۆزش و شـۆری مـەقاماتم
دەڵـێن فەموویـە یـار بێتـە موتـالای خـەتتی رەیحـانی
بڵـێن بـا شـەمعی روخـساری هەلأیـسێنێ ئـەوا هـاتم

بـه شـیرینی مـەزەی لێـو و خـەتی سـەبزت دڵـم خۆشـە
لە مەیخانـەی غـەمی عیـشقت کـەوا سـەر مەسـتی سـەهباتم
بە یادی مەدرەسـەی عیـشقت گـەلێ عـیلمم کەسـب کـردن
ئەوێـستاکەش لەبـەر چـاوت شـەراب خـۆری خـەراباتم
قڕانـی عاشـقانە کـەس نـەما دەرچـێت و سـەر دەرکـا
مەگـەر بـۆ موفلیـسی وەک مـن کـەبێ قـڕان و پـەناباتم
کەوا پارچـەی غـەزەل دەبـڕێ "حـەریق" ئـەمڕۆ لـە دیوانـت
دەڵـێ هـەر چـاوەڕێی دەسـتە خەیاتـەی زوڵفـی تاتـانم

***

## دڵی غافڵ

خــەیاڵت مونحەســیر بــوو ئــەی دڵــەی غــافڵ لــە دنیایــە
نەدامەت بــوو نەتیجــەی ئــاخری ئــەم ئــەم شــۆڕ و غەوغایــە
ئەوا لازم بــوو سەرخۆشــی، لــە تــۆ ئــەی دڵ کــە سەرخۆشــی
بــە بــادەی غــافڵی بــێ هۆشــی دەردت قــەت شــفای نایــە
عەجــەب بــۆت بۆتــە زســتان زەمهــەریری بــاری عیــسیانت
کەشــک نابــەی چ ســەرمایە، دەڵێــی وەیــوەی چ ســەرمایە
بــە دەســتی دێــوی نەفــسم دڵ وەکــو مــورغی بــێ پەروایــە
وەکــو پەروانــە بــۆ شــەمعی تەلەســمی ئــەو، بــێ پەروانــە
کــەتفڵی عیــشقی بــی مەشــقم لــەنێو بــازاڕی ســەودایە
بــە ئــەو ســەودایە سەرخۆشــە دەڵــێ کــارم لــە ســەودایە
هــەتا شــەیتان مــودەببیر بــێ، موئــەددیب نەفــسی زاڵــم بــێ
عەجــەب کەوتۆتــە دەســت زاڵــم ئومــورت عــەینی زوڵمایــە
خودا ڕەببی نــەجاتم دەی لــە دەس ئــەم دێــوی بــێ ڕەحمــە
کــەوا وەک دوژمنــی خــوێنی بــەداییم لــێم بــە داوایــە

خـــه‌یالاتت هـــه‌مو په‌شـــمه وه‌كـــو ریـــس و گـــوریس وایـــه
هه‌چـــی ده‌یكـــه‌ی ده‌ڵـــێن هه‌هـــه‌ی فلانـــی چـــه‌نده ریـــسوایه
كـــه خـــاڵی بـــێ دڵـــی عاشـــق لـــه بـــاده‌ی حـــوببی مه‌عـــشوقی
بـــه خۆراییـــت نـــه‌وێ چـــاكه وه‌كـــو شیـــشه‌ی شـــكاو وایـــه
مه‌بـــه تالـــب بـــه زوڵفـــه‌ینی بـــه میـــسلی شـــكڵی لاوایـــه
ئه‌گـــه‌ر لـــه‌و لایـــه خـــۆت لاده‌ی لـــه‌لام ته‌حقیقـــه ئـــه‌و لایـــه
لـــه قـــاپی ئاســـتانه‌ی مورشـــیدی ئه‌رشـــه‌د "عـــه‌لی عـــالی"
لـــه‌وێ ڕۆحـــت فیداكـــه تـــۆ نـــه‌جاتت هـــه‌ر لـــه‌وێ دایـــه
وه‌كـــو په‌روانـــه بـــۆ شـــه‌معی جـــه‌ماڵی ئـــه‌و كـــه موشـــتاقم
بـــه ته‌ســـویری "حـــه‌ریقم" هێنـــده ســـۆزی ئـــه‌و لـــه دڵ دایـــه.

***

## گەوهەری مەعنی

بــە خــەیاڵی شــەوی وەســڵت خــەوی هیجــرانم دی
بەشـــەمیمی نەفەســـت ســـروەیی حیرمـــانم دی
چـــاوی بیمـــارت ئیـــشاراتی شـــفا دەنوێنـــێ
لـــە خـــەتی مەســـحەفی رووت ئایـــەتی لوقمـــانم دی
ســـەیری زوڵفـــت کـــە لەســـەر ئـــاگری ڕووت وێـــستاوە
حـــەیی بـــێ جانـــە لەبـــەر چـــاو و بـــە پـــەیمانم دی
بـــە هـــەوای عەرعـــەری قـــەددت لـــە خـــەیابانی خـــەیاڵت
شـــێعری بـــەر جەســـتە وەکـــو ســـەروی خـــەرامانم دی
ڕوخـــی نـــەورۆزی نـــەبوو، خێـــزی خـــەتی ماتـــەمی گـــرت
ڕۆژی ئیمـــساک و شـــەوی قـــەدری حـــەبیبانم دی
گەوهـــەری مـــەعنی لـــە دەریـــا چـــەیی دڵ دێنمـــەدەر
تـــا لـــە حوققـــەیی دەهـــەنت لـــەعلی بەدەخـــشانم دی
هـــەر بـــە ئـــاودا چـــوو ســـەفینەی غـــەزەلی بـــەحری خـــەیاڵ
لـــە جییـــات ســـوودی مـــەتاعم زەرەر و زیـــانم دی

لەگــەنی دیـــدە، فتیلـــەی مـــوژەوورە و غـــەنی ئاهـــ

بـــۆ شـــەوی وەســـڵی لـــە ســـەد لاوە چـــراغانم دی

لـــە نـــەوای تەغنیـــەیی بولبـــولی دەوری گـــوڵی ڕووت

لـــە هـــەموو مـــورغی چـــەمەن ناڵـــەو و ئـــەفغانم دی

گەوهـــەری نـــەزم و دوڕی مـــەعنی لـــەفزی ســـەدەفم

بـــردە بـــازاڕی نـــــەزەر موشـــــتەری نـــادانم دی

لـــە قەباڵـــەی کـــەرەمی ئـــەهلی هونـــەر تێفکـــریم

وەکـــو ئەشـــعاری "حـــەریقی" خـــەتی بـــوتلانم دی

***

## فرمێسکی نەدامەت

کـــەی دێیـــەوە ســـەر ڕەحمـــی دڵـــی زار و نـــەزارم؟
کـــەی دێ قـــەدەمی خێـــرت لەســـەر خـــاکی مـــەزارم؟
تاکـــەی لـــە تـــەوافی حـــەرەمی قیبلـــەیی ئـــەبرۆت
وەک پەرچـــەمی پێـــشانی ســـەر ئەفکەنـــدەو و خـــوارم؟
جـــارێ نـــەبوو جـــاری نـــەبێ فرمێـــسکی نەدامـــەت
بـــارێ نـــەبوو بـــارێ نەیـــەنێ بـــۆ دڵـــی زارم
قوربـــت ســـەبەبی بوعـــدە لـــە یـــار و لـــە دییـــارم
ڕازیـــم بـــە جـــەفا گـــەر بـــە وەفـــا بێیـــە دییـــارم
بـــۆ لـــەززەتی عـــەفوت کـــە جـــەریئم لـــە مەعاســـی
مەدرێنـــە دەخیـــل پـــەردەیی ڕوخـــسارەیی کـــارم
چـــت داوە لـــە ڕووترشـــی و ســـرکەی دەمـــی ئـــەغیار
قەنـــدی لـــەبی شـــیرین بـــە دەمـــی تـــاڵی خومـــارم
ئـــەی عەرعـــەری بوســـتانی هیدایـــەت وەرە باغـــان

داغانی قییامەت کە قەدی سەرو و چنارم

گوێ مەگرە لە ئیهرار و لە ئیسراری رەقیبان

من سەد غەزەبت بێ لە عەفوت چاوە نوواڕم

تا دیومە لەنێو مەسحەفی رووت سورەیی "یۆسف"

بۆ ئایەتی حوسنت لە هەمو رەسمێ کەنارم

تاووس کەلەسەر زینەتی باڵی، سەری دانا

ئەمنیش بە پەڕی فکرەوە بێ سەبر و قەرارم

پەروانەیی شەوقت مەخەرە ئاگری میحنەت

شەمعی دڵەکەت هەڵکە لە بۆ بەزمی نیگارم

مۆرەی دڵی برد زوڵفی لە بۆ تەختەیی سینە

لەم نەردە مەلین وا مەیە، دێم فێری قومارم

گەر باڵ و پەڕی بەخت نەسووتایە "حەریقی"

بۆ سەیدی مەعانی بەمەسەل بازی شکارم

***

## پرتەوی شەمس

هێنـــدە بێـــزاری کـــە زانیومـــە بـــە زاری نایـــەوە
دور لـــە بالاکـــەت ســـەرینی نائومێـــدیم نایـــەوە
بـــۆ پیالـــەی مـــەیلی لـــەیلا قـــەلبی مـــەجنون قابیلـــە
شۆڕشـــی شـــیرین لـــە نالـــەی کۆهکـــەن فـــا مایـــەوە
حـــەیفێ هینـدەت دەربـەدر کـرد دڵ لـە ئیقلیمـی ویـسال
شـــیری منـــداڵیت بـــە زەهـــری هیجـــر پـــێ هێنایـــەوە
بولبـولێکی خـۆش نـەوا بـووم بـۆ نـەوای دەوری گوڵـت
کـــێ وەکـــو هـــود هـــود حیکایـــاتی ســـەبای گێڕایـــەوە
بـۆ کـەناری سـەوزەیی دەوری، گـوڵی روت شـین دەکـەن
خـــاکی کـــۆی عیـــشقت بـــە بێـــژنگی ســـەرم بێژایـــەوە
کەوتـــە نێـــو خـــەرمانی عـــومرم ئـــاگری تـــوولی ئەمـــەل
ســـەد کـــەرەت بـــارانی وەعـــزی لێـــدرا نەکوژایـــەوە
تیری موژگـان، شـیری ئـەبرۆ، تـاق و جـوت دەنوێنـێ پـێم
تـــا بـــزانم رۆحـــی شـــیرینت چـــلۆن کێـــشایەوە

جێی نەزەر بوو حاشییەی زوڵفت لە سەر ئایاتی ڕووت

زۆر موتالاّم کرد، وەکو دەور و تەسەلسول مایەوە

تاقی میحرابی بڕۆت جێی ناوە بۆ ئەهلی نییاز

سۆفی وەیزانی کەچە، هێند کەر بوو خۆی گێڕایەوە

شەمعی خوبان پرتەوێکی "شەمسی" ڕوی تۆی لێکەوت

هێند حەیا و شەرمی بە خۆیدا هات، بەجارێ توایەوە

گوڵ بژێرێکی زەریفم کرد لەنێو باغی خەیاڵ

خۆزگە مەردێکی "ڕەشید" بۆ شێخی بخوێندایەوە

***

## ئەسراری سوبحانی

لـە گۆشـەی گوڵخـەنی تـەن تـا بەکـەی ئیمـانی حیـسبانی
بـە ئیمـانی شـهودی بێـرە نێـو ئەسـراری سـوبحانی
مـەڵێ تاریکـە رێگـەم پەرچـەمی پـڕ خـەم دەبەسـتێ ئـەم
شـوکر وەک رۆژی رووناکـە سـەفیدەی سـوبحی پێـشانی
دەمێکـە هـەر وەکـو بولبـول لەسەرچڵ، سەرچـڵ و شـێتی
زەمـانێکیش وەرە سـەیری نـەمانی بـاغی عوسـمانی
خوِتـوورت رێـی حـرووری بەسـتوویی بـۆ مەجلیـسی بـاقی
دەترسـم قـەت نـەبی لاقـی کـەوا تـاقی، دڵـەی فـانی
هەتاکـەی تـۆ لـە غەفڵـەت دا دەنۆشـی ژەهـری خامۆشـی
ئەگـەر عـەقڵت هـەبێ بەسـیە زەمـانی جـەهل و نـادانی
وەکـو شـانە هـەتا جەمعـە خـەیاڵت بـۆ پەرێـشانی
بـە دیـدارت قەسـەم ئـاخر پەرێـشان و پەشـیمانی
دەبیـنم هەرکەسـێ توحفـەی خولوسییەت لەگـەڵ تاعـەت
دەبـا بـۆ خزمـەتی مورشـید بـە قـەلبی پـاکی نـوورانی

منـــيش بـــاری خەجاڵـــەت وا لەســـەر شـــانم کـــە نـــاتوانم

لـەژێر پـا پـێ لەبـەر پـێ نـێم خـودا هـەر تـۆ کـە ڕەحمـانی

خـــەتاباتی جـــەدەل ئـــەمڕۆ یەقینـــە سەفـــسەتەی مـــەحزە

نەتیجـــەی ئـــەووەڵی فکـــرم قیاســـی کەوتـــە "بورهـــانی"

دەڵـــێن هاتۆتـــەوە شەخـــسێ ســـەمیبی ئەشـــرەفی عالـــەم

جـــەنابی ســـەییدی ئـــەکرەم، شـــەفیعی قاســـیبو دانـــی

لـــە کەعبـــەی عاریفـــان ئـــەمڕۆ لـــە بـــۆ زومـــرەی مریـــدانی

فیـــوزاتی نەســـیبی عالـــەمی موشـــتاقی خـــۆی هـــانی

بـــچین بـــۆ خزمـــەتی چـــاکە بـــە ئیخلاســـێکی مەردانـــە

دوعامـــان بـــۆ بکـــا بەڵکـــە لـــە شـــەڕڕی نەفـــسی زوڵمـــانی

وەکـو پەروانـە هـەر لـەحزە "حـەریقی" شـەمعی جـەمعیکم

خـودا کـەی بـی مونـەووەر بـم بـە نـوری مـاهی تابـانی؟

***

## غونچەی مەقسود

موژدە بێ بۆ بولبولی دڵ گوڵ لە باغان هاتەوە

قومری عومری خۆی سەرف کا سەروی بۆستان هاتەوە

شاسوواری عەرسەیی مەیدانی مەردان هاتەوە

دڵبەری جانان لە خزمەت جانی جانان هاتەوە

پیری ڕەوشەن دڵ وەکو خورشیدی تابان هاتەوە

ناییبی عوسمانی سانی خۆش بە سامان هاتەوە

وا موعتتەر بوو دەماغی ئەهلی نیسبەت هەر دەڵێی

نیسبەتی پیراهەنی یۆسف بە کەنعان هاتەوە

بۆ ئیفادە و نەشری فەیز و لوتف و بۆ ئیرشادی دین

وا لە قەسری عاریفان یەنبوعی عیرفان هاتەوە

غونچە سەر پۆشی لە ڕوو لادا بە عەزمی دیدەنی

بولبولی تەبعی منیش بۆیە غەزەل خوان هاتەوە

سەرخۆشی کەئسولکەرەم سەرمەستی سەهبایی قیدەم

باشکوهو با حەشەم، مەجزووبی رەحمان هاتەوە

موددەتێ بوو ئەم هەوارە بێ سەدا و هاوار بوو
تا بە جەزبەی حەق بەسانی نەی بە ئەفغان هاتەوە
خاتری موخلیس بە دیدارت وەکو تەبعی حەریق
غونچەیی مەقسودی پشکوت و بە خەندان هاتەوە

***

## خوسرەوی خویان

ئــــەم خوســــرەوی خوبانــــە کــــەوا دێتــــە نــــەزارت

شــــیرینە ئەگــــەر دڵ بڕفێنــــێ بــــە ئیــــشارەت

ئیــــسمێکی شــــەریفی هەیــــە مەنعــــە لــــە تەســــەڕڕوف

جیــــسمێکی لــــەتیفی هەیــــە لاییــــق بــــە ســــەدارەت

نەقــــدی دڵ و ڕووحــــم هەیــــە بــــۆ مــــوژدە لــــە ڕێ دا

زۆر لاییــــق و شایــــشتەیە بیــــدەم بــــە بەشــــارەت

میــــوەی ئەمــــەلم کاڵــــە بــــە دوو چــــاوەیی کــــاڵی

کــــالایی خــــەیاڵم هــــەموو ڕۆییــــوە بــــە غــــارەت

لــــەو وەختــــەوە. تــــەخفیف کــــرا ئیــــسمی شــــەریف

مــــن ســــوکی لــــەلام بۆتــــە نیهایــــاتی وەزارەت

نوقتــــەی دەهــــەنت وا دڵــــی هێناومــــە تــــەنگی

جێگــــایی خــــەیاڵی نییــــە بــــۆ فیکــــری بــــە کــــارەت

تـــۆ ســـاحێبی ئـــەم چـــاهی زەنەخدانـــە بـــی قوربـــان
ســـەد یۆســـفی کـــەنعانی دەبـــێ بێتـــە زییـــارەت
بـــاکم نییـــە لـــەو خەنجـــەرە دەیکـــەی بـــە کەمـــەردا
شمـــشێری بـــرۆت جـــەرگی بڕیـــوم بـــە ئیـــشارەت
شـــەیتانی ڕەقیـــب دوشـــمنمە بۆیـــە کـــە ڕەحمـــان
ڕەحمـــی نییـــە بـــۆ حـــاڵی دڵـــی پـــڕ لـــە مـــەرارەت

***

## گەنجی فکر

بولبـــولی دەوری گـــوڵ و تـــوتیی شەککەرشـــکەنم
قـــومریی ســـەروی خـــەرامان و تـــەزەروی چـــەمەنم
بـــێ نـــەوا و ســـاحێبی ئـــاوازی حـــەزینم بـــە نـــەوا
شـــەمعی هـــەر جـــەمعم و پەروانـــەیی هـــەر ئەنجومـــەنم
ســـوحبەتی قودســـی و ســـەیری مەلـــەکوتیم دانـــا
بـــە عەلاقـــەی ئـــەم و ئـــەو هـــەم دەمـــی زاغ و زەغـــەنم
لـــەززەتی جەننـــەتی ڕووم داوە بـــە دانـــەی خـــاڵی
ئەمـــە ئیرســـی پدەریمـــە بـــە پـــسەر پـــێ دەکـــەنم
مڵکـــی تەجریـــدی بـــەجێ هێـــشت و بەهەشـــتی دانـــا

ئێـــسته گیرۆدەیـــی خـــار و خـــەس و دار و دەوەنـــم

بـــە هـــەوای ئـــاوی حـــەیاتی دەهـــەن و نۆشـــی لـــەبی

خـــــدری زینـــــدەیی سەرچـــاوەیی چـــاهی زەقـــەنم

هاوســـەری موشـــکی ســـەری زولفـــە قـــەتاری نەفەســـم

مـــــالیکی قافڵـــــەیی چـــــینی خـــــەتاو و خوتـــــەنم

مەجمـــەعی ســـینەو و فینجـــانی مـــەم و شـــەربەتی دەم

خەلعـــەتی پـــارە کـــە زانیویـــە غـــەریبی وەتـــەنم

قەنـــدی لێـــوی تەڵـــەبی چـــاییە، ســـا، ســـر کە مەکـــە

نـــەک بـــەتاڵی بـــدوێ خوســـرەوی شـــیرین ســـوخەنم

وەجـــدی مـــەجنون لـــە پیباڵـــەی غـــەمی لەیلادایـــە

بـــە خـــەیاڵی لـــەبی شـــیرین، بێـــستون هـــەڵ دەکـــەنم

شـــادی بێگانەیـــە، خـــزمم غەمـــە گـــەر مردیـــشم

ئـــەوە واریـــس لـــە حیـــسابی حـــەق و گـــۆڕ و کەفـــەنم

گـــەنجی فیکـــری کـــە لـــەنێو کـــونجی غـــەما دیوەتـــەوە

مڵکـــی شـــادیم هەیـــە تـــا ســـاکینی بـــەیتول حـــەزەنم

تیرەکـــەی بەخەتـــەرە یـــاری کـــەمان ئـــەبرۆ حـــەریق

گەرچـــی ئـــەو ڕۆســـتەمە ئەلحـــەق ئـــەمنیش ڕۆبیتـــەنم

***

## ماران گەستە

لـە قەیـدی زەیـد و عـەمرانیم و دڵ پـا بەسـتەیی تۆیـە
لـە هـەر وەختـێ رەهابـێ پـێ دەزانـم ڕسـتەیی تۆیـە
دەبێتـە ئیفتـراو بوختـان ئەگـەر نیـسبەت وە غـەیری دەم
بـە هـاژەی زوڵفەکـەت زانـیم کـە مـاران گەسـتەیی تۆیـە
سـەرا سـەر رەخنـەیی چـاوم نیـشانەی تیـری موژگانـە
لـەلای خـۆی چەشمەسـارو سـەبزەیی نەورەسـتەیی تۆیـە
حوبـابی ئەشـکی حەسـرەت بۆتـە فنجـانی سـەرو سـینەم
لە جێی دەسـتە گـوڵی لێـدەن دەڵـێن گـوڵ دەسـتەیی تۆیـە
گڵـی بێنـی بـە سـەرما کـەی، گـوڵی بێنـێ بـە سـەرما کـەی
غـەم و شـادی سـەرپا هەرچـی بـێ وا بەسـتەیی تۆیـە
دڵم شیشەی شەرابی ڕووتـە سـرکەی غـەیری گـەر تێکـەم
گـوڵاویش بـێ گـڵاو بـێ، شیـشە چـۆن بەربەسـتەیی تۆیـە
شکەسـتەی دەسـت بەسـتە چـاوەکەم جـەبری لـەلای تۆیـە
مـەڵێ کەسـرە بـە شـانم چـون شکـستە و بەسـتەیی تۆیـە
تـەنافی زوڵفەکـەت لادە، خـەیابانی خـەیاڵم ڕاسـت

بە باڵای سەروی مەوزون و قەدی بەرجەستەیی تۆیە

ئەتیبیا حەببیان مەسمووم و دانەی حەببیان پووچە

ئەوە مەغزێکە بێ ئەمرو دەهانی بەستەیی تۆیە

بە ئومێدی دەوابوو لەززەتی دەردی، دڵم دەردێ

دەزانم چون گوسەستەی تۆ هەموو پەیوەستەیی تۆیە

ئەگەر دەردت نەبایە نیسبەتت چون دەبوە دەرمانم

کە هەر کەس دی دەڵێ قوربان "حەریقی" خەستەیی تۆیە

***

## دەردی رەحمەت

لە ئادەم تا بە خاتەم جوملە عالەم پڕ سەدا و سەیتە

بە عیشقی حەزرەتی لەولاک ئەوی زیندو نەبێ مەیتە

تەتیممەی هەر سەلات و خاتیمەی حەمد و تەحییەی حەق

سەنا بۆ ئال و بەیتە، باقی هەر ئەفسانەوو بەیتە

لە پاش سیغەی تەرازی و ئایەتی تەتهیری سەحب و ئالی

بە قوربان مەدحییان نایە بە جوملە زەیتەوو کەیتە

که تۆش لەو نەسلەیی جەددت رەزا بێ شێر بە گوێ دەگری
وەکو رێوی زەلیلی گورگی نەفسم، سا، لە بو کەیتە؟
لە خۆت و جەددی خۆت و نەسلی پاکت چاوەڕێی لوتفم
لە ڕێی حەق دا موعینم بن لە غەوغای ڕۆژی یالەیتە
بە شاهید بن سەگی قافلەی تەریقی ئال و ئەسحابم
هەمیشە گوێ قولاغی بانگی هەی هەیم و سەدای هەیتە
بە ئیستیمدادو لوتفی "بابەشێخ" و هیممەتی کاکی
گرۆگالێ دەکەم تا بلێن لە چاو کوێر و شەلان پەیتە
کەسێ "سالح" بێ بۆ زیکر و دوعا گۆییت بەبێ چاوی
هەزار چاوساغی وا دێنێ بە چاو زیندو بە دڵ مەیتە
لە بۆ تەشریفی ڕێی میعراجی جەددت بوو، نیدای هاتیف
"تعال یا حبیب الله تمن ما تمنیت"
دەری رەحمەت گوشادو بابی تۆ بەو ڕێی رەجا واسیع
دەسا تۆش هیممەتێ کە جەعفەری تۆ ڕوکنی ئەو بەینە

***

## خەرمانی ئەمەل

لە خەرمانی ئەمەل مێرووی عەمەل جەزبی نەکردانێ
لە زەیقەت خانەدا ترسم هەیە ئاخر سەری دانێ
ئەڵێن جەردەی ئەجەل ڕێگا بە کاروانی نەفەس ئەگرێ
شەقامی سینە دەبڕێ بۆ مەتاعی دیدە ئەڕوانێ
تەریدەی نەفس و شەیتان قافڵەی تاعاتی غارەت کرد
ئەگەر جاسووسی ئیمانێ نەبێ دەرناچی ئینسانی
تەرازووی تاعەتت لەنگە هەتا کەی ئەم سەر و ئەوسەر
بە پارسەنگی حەیا دەس هەڵبڕە، بنوارە میزانێ
بەسێ بێ تاعەتی ڕووکەش مەلەک سەرڕاڕفی ئەعمالە
موحەسسیل نەقدی قەڵب و نارەوا نا باتە دیوانێ
ئەوا بەردی ئەجەل هات و لە شوشەی عومری دا ساقی
بە قوربانی پییالەی چاوەکەت بم تێکە فینجانێ
حەیات خۆ چوو لەنێو جامەی حەیاتی عارییەت بێ عار
ئەوە داوای ئەکەن چبکەم "حەریق" ڕێگەی ڕەجا کوانێ؟

***

## رازی عشق

حــوزنی مــن یــا حوســنی تــۆ ئیــشکا لــه تــا ئــاخر نه‌فــه‌س
چــۆن زه‌کــاتی حوســنی تــۆ یــا حــوزنی مــن ناگــا بــه کــه‌س
زاهیــــره‌ن فه‌رمووتــــه وه‌ختــــی مردنــــی حــــازر ده‌بــــم
وا لــــه خۆشــــی مــــردنم ده‌مــــرم، ده‌ســــا ئینــــسافه بــــه‌س
چۆن ده‌کـه‌ی مـه‌نعی دڵـی مـن تۆ لـه شـه‌هدی لێـوی خـۆت
لێــوی تــۆ وه‌ک شه‌ککره‌ســتانه دڵــی مــن وه‌ک مه‌گــه‌س
چــاوه‌که‌م لــه‌و بــاغی حوســنه مــه‌نعی چــاوی مــن مه‌کــه
لازمــــه بــــۆ پاســــه‌وانی باغه‌کــــه‌ت جۆتــــێ عه‌ســــه‌س
تــازه فه‌رمووتــه لــه‌لای کــه‌س رازی عیــشقی مــن مــه‌ڵێ
نه‌ت ده‌زانی دڵ که کون بوو ده‌نگی لـێ دێ وه‌ک جـه‌ره‌س ؟
پێــی بڵــێن زاهیــد بــه‌خێری خــۆی لـه وه‌عــزی مـن گــه‌ڕێ
عیشقی مـن شـوعله و بڵێسه، وه‌عـزی ئـه‌و وه‌ک خاروخـه‌س
خــاڵی ســه‌وزه، داخــی ســه‌وزه، باســی ناســۆری مه‌کــه‌ن
تـا زه‌ده‌ی تـۆ بـێ کـه نـاری قـه‌ت شـیفای نایـه بـه کـه‌س

***

## پارسەنگی حەیا

خـودا تۆبـە لـە دەس شـۆخێ کـە وەختـێ عیـشوە دەنوێنـێ
سـەری تۆبـەی مـەلا و زاهیـد بـە بـەردی جیلـوە دەشـکێنێ
سـتوونی قامـەتت راگرتـووە بـۆ خێـوەتی دیـنم
خـودا بـۆ تـوولی عـومرت ئـەو تـەناف و دارە نەپـسێنێ
لـە رەمـزا حیکمـەتول عـەینی ئیـشارەی چـاوی بیمـارت
بـە قـانونی ئـەدەب ئایـەی شـفا بـۆ ئێمـە دەخوێنـێ
نەخۆشـی دەردی هیجـرانم ویـسالی تۆیـە دەرمـانم
شـفام نایـە مەگـەر بێنـێ نەسـیمی بەرچـەمت بێنـێ
خـەیاڵی نەوبـەهار و سـەیری گـوڵزاری عـەزیزانم
گەهێ بۆ ڕووی گوڵ و گاهێ لـە بـو سـەبزەی خـەتم دێنێ
زرێـی زوڵـف و مـوژەی تیـر و بـرۆی شمـشێری راکێـشا
لـە زومـرەی عاشـقانی خـوێن بـەهای روخـساری دەستێنێ
لـە ڕێـی بـادەی پێیاڵـەی چـاو و شیـشەی گـەردنی سـاقی
کەسـێ گـەر ئـابڕووی بـێ ڕەنگـە جـامی عەیـشی بڕژێنـێ
دەزانـی بـۆ تـەرازووی زوڵفـی سـەرناکا لـە هـیچ لاوە؟

بــه پارســـەنگی حــەیا دەســتی لـــە میزانـــا دەبزوێنـــێ
حـــەریقی نـاری هیجـران و غــەریقی ئەشـکی حیرمـانم
ئەگــەر ئــەو بــێ دەخنکێنــێ، ئەگــەر ئــەم بــێ دەسـووتێنێ

***

## گەوهەر فرۆش

عاشـقانی سـەروی قـەدت قـومری سـیفەت زاری دەکـا
ڕووی گــوڵی تـــۆ بولبــولی دڵ فێـری غــەمخواری دەکـا
خــۆت وەکــو ســوڵتان و چــاوت حــاکم و ئەبرۆتــە شــیر
تیــری موژگانـــت وەزیـــرە مەشـــقی خونخـــواری دەکـا
کەوتـــە نێـــو زوڵمـــاتی زوڵفانـــت دڵـــی ئەســـکەندەرم
خـدری زینـدەی ماچـی لێـوت، کـەی دێ رزگـاری دەکـا
مـــن بـــە میزانـــی تەبیعـــەت گەوهـــەر ئەفرۆشـــم، دڵـــم
وا لـــە شـــامی زوڵفـــی تـــۆدا کەســـبی عـــەتتاری دەکـا
مەیخــەرە ژێـر پێتــەوە گــەر حــەز دەکــەی ژێـر بێتــەوە
دڵ کــە منداڵــە شــەکەر خەنــدەی لــەبت جـاری دەکـا

مــورغی دڵ بــرژا لەبــەر قرچــەی هــەتاوی فێرقــەتت

تــا بەکــەی داوی ســەری زوڵفــت گرفتــاری دەکــا

تــوتێی دوکــانی حوســنت بولبــولی تــەبعی منــی

خــستە نێــو بەنــدەی تــەماع و فێــری بــازاڕی دەکــا

مەســتی بــادەی چــاوی ئــەوم و پــێم دەڵــێ مەســتی مەیــە

ســەیری کــەن بوختــانی ناحــەق چــۆن بەلــەب جــاری دەکــا

بێرە مەیدانی فەســاحەت ئەســپی خــۆت لینــگ دە "حــەریق"

تــا بــزانم کــێ بــە شــیعرت ســوحبەت و یــاری دەکــا

***

## وڕێنەی خەیاڵ

وەفــای مــن بــێ بــەها بــوو بــۆ ڕەواجــی مامەلــەی یــاری

ڕەزام یــارم کــە ئــەو داویــە بــە چــینی فیتــی بــازاڕی

لــە ســەودادا "ڕەشــیدە" تــالبی قــازانجی ئەشــیایە

هــەتا زوتــر لەناوچــێ چــاکە ئەجناســی وەفــاداری

مــەتاعی مەعریفــەت جینــسی وەفــا، فەســڵی نــەما، فــەوتا

ئــەمن نــابوودی ئــەو بــووم نــا بەڵــەد بــوو مەخریــداری

رەواجــی نەقــدی عەهــدی ســکەکەیی دێرینــە فــەوتاوە

بــە ئەسکیناســە ئێــستا مامەڵــەی بــازاڕی مــەککاری

بینـای خانـەی وەفـا وەک تـاقی کیـسرا کـۆنگرەی رووخـا

ئـەمن تـازە تـەنافی جـوت دەکـەم بـە تـەرحی میعمـاری

قـسەی تـرش و قـسەی خۆشـم وڕێنـەی حـاڵی ناخۆشـە

بـەبێ کـەیفی کـە زۆر و کـەم خەبـەردارنیم لـە میقـداری

لە دەسگای نەگبەتا هەر کـەس چـووە سـەر تـەختی بەدبـەختی

نــەدیم ئیقبــاڵی ناکــا بــۆ وەزارەت بەســیە ئیــدباری

شــەوانە لازمــەی تەشــریفی مــەنزڵ بــۆ کەســانێکە

خــەریکی ئیــستراحەت بــن بــەنازو نیعمــەتی ســاری

هـەزار حـەیفێ "حـەریقی" قـەت بـە زەوقـی خـۆم نـەبوو جـارێ

بڵێـی بـەخوا زەریفـت کـوت بـە مەسـتی یـا بـە هوشـیاری

***

## بێ چاوەڕێ

لــەلام وابــوو کــە تــۆ "ســەیید ڕەشــید" یــاری لــەبۆ یــاری
لـــــە مڵکـــــی میهرەبـــــانی دا لـــــە یـــــارانی وفـــــاداری
لەگـەڵ هــەر زەڕڕە بـۆ جیلـوەی جــەلای میهــری جیهـان ئـارا
لــە شــۆقی موشــتەری، نــوری قەمــەر وەک زوهــرە سـەییاری
جــەواری ڕەحمــەت و دەســتگاهو پێــشگای عــەدل و ئینــسافی
لـــە دەربـــاری فـــەقیران ڕاســـت ئـــەمینی ئـــەهلی دەربـــاری
لـــە زومـــرەی "چاوەشـــانی" بارەگـــای بـــاری ســـەلای عـــامی
لە حەلقـەی مەهوەشـان سەرخۆشـی و هـەر مەسـت و هوشـیاری
تەلیعـــەی فـــەوجی ئـــەوج و یـــاوەری ســـوڵتان و ســـەرهەنگی
لـــە ســـەربازانی مومتـــازی، لەســـەر عەســـکەر قومانـــداری
چ خێر بوو دەوری بەزمت بێ سـەدای شاباشـی "چـاوەش" چـوو؟
نـەوای تـارت چـەنەی تـاربوو دەمـی پیـک ساز نـەهات بـاری
نـــەوەک مـــە دوورە ڕێ و بـــێ چـــاوەڕێ مـــاوم لەبـــەر چـــاوان
لـەدەس چـووم و لـە پێ کـەوتم، بەسـەر زینـدوم بـە بیمـاری
نـە قورعـەی مـن لـە جیبـی جامەخانـەی مەرحەمـەت دەرهـات

نــە روقعــەی تــۆ بــە رەســمی توحفــە دیــداری بــووە دیــاری
کە تۆش هیچ بووی، وەکـو مـن بـا لـە مـەولا، ڕوو لـە مـەولا کـەم
بــە خــوا غــەیری مــن و تــۆ وەک مــن و تــۆ بــوون مــەدەدکاری

***

## ئاگری غەم

تـــەعاروفی بـــە ســـیغارە، شـــیعاری ئـــەهلی کیبـــار
ســـەبیلی عـــادەتی مەســـدودە بـــۆ رەواجـــی ســـیغار
لـە قـاوەی قاوەچـی هـەر کـەس کـە مەشـرەبی چـا بـێ
بـــە دودی قەننـــە قەناعـــەت دەکـــا فـــەقیر و هـــەژار
میزاجـــی ئـــادەمی خـــاکی هـــەوا بـــە ئاویـــادا
عینـــانی ســـەبر بـــە دەس بـــا گەیـــشتە کـــوورەی نـــار
بـــە مڵکـــی وەحـــدەت ئەگـــەر ئاشـــنا بـــێ مـــونکیری حـــاڵ
دەزانـــێ عـــومری عەبـــەس بـــوو لـــە کەســـرەتی ئـــەغیار
زەرەری نـــەبێ ســـەمەرێکی نییـــە درەختـــی غـــەیر
ئەگـــەر بـــە بـــەرد و پـــلار سەرچـــڵی بخەیتـــە خـــوار
دەرەختـــی مڵکـــی دڵـــم میـــوەییکی کـــاڵی هەیـــە
خـــودا بکـــا بـــە تەحـــەممول بگـــا بـــە ســـەبر و قـــەرار
بـــە داغ و حەســـرەت و غـــەم دەچـــمە حەلقـــەیی ماتـــەم
ســـەفایەکی نـــەبوو ســـەعییم لـــە تـــەوفی کـــوی نیگـــار
لـــە وەختـــی عالـــەمی ئـــەڕوا حـــەوە هـــەتا ئێـــستا

سـەفەر دەکـەم نەگەیـشتم بـە مـەنزڵی دڵـدار
فیـدای زینـدە دڵانـی تـەریقی خوبـانم
هەمیـشە تـازە دڵـن وەک گـوڵی هەمیـشە بـەهار
لـە چەشمەسـاری مـەعاریف کەسـێ نەسـیبی نـەبێ
هەمیـشە چـاوی تـەڕە، زاری وشـکە، لێـوی بـەبار
حـەریقی ئـاگری غـەم سـیخی عـومرمی سـووتاند
کـەبابی سـینە بـە ناپوختـە هاتـە مەجلیـسی یـار

***

## دڵی غەریب

دەرچـــوونی گـــەلیٚ موشـــکیلە، دەرچـــونی قەریبـــە
رِۆحـــم، دڵەکـــەم مـــاوە بـــە تـــەنیا، وەرە بیبـــە
قوربـــانی ویـــساڵت بـــم ئـــەوا کوشـــتمی هیجـــرت
خـــۆت واریـــس و حەقـــدارمی قـــاتڵ کـــە رەقیبـــە
خـــۆت دیوتـــە لـــەنێو میـــسری مەلاحـــەت چ غـــەریبی
سبـا، رەحمـــیٚ بـــە حـــاڵی دڵەکـــەم کـــە، کـــە غەریبـــە
هـــەر دوکـــەڵی زوڵفـــت و روخـــی نـــارت ســـەبەبە، وا
ئەشـــکم کـــە پەیاپـــەی دیٚ، دەروونـــم بـــە لەهیبـــە
رەببـــی بەخـــەدەنگی غـــەمی دووری دڵـــی کـــون بـــیٚ
هەرکـــەس لـــە نیگاهـــت کـــە بـــە ئـــارام و شـــەکیبە
وازەن مەبـــە گیـــان ســـەخت و ســـەمەرگم کـــە نـــەمردم
ئومێـــدی ویـــسالت وەکـــو لوقمـــانی تەبیبـــە
تـــا بـــووری مـــوژەت چـــەندە بەتـــەرتیب و نیزامـــە

بۆ سەف شکەنی دڵ چ سوپاهێکی مەهیبە

وا لە شکری ئاهم چووە سەرکافری زوڵفت

گەر شاهی روخت لێ بگەڕێ سەیری عەجیبە

بۆ موشکی خەتا چوو بە خەتا کەوتە ئەنێو چین

لەو بۆنەوە هەر زوڵمەتە شامی بە نەسیبە

قوربانی وجود و ئومەنای شاهی روخت بم

هەرییێکە لە جێی خۆی چ ئەمیرێکی ئەهیبە

تەسکینی دڵت هاتووە ئۆخەی کە "حەریقی"

یارت کە بە خوێنی جگەرت کەففی خەزیبە

***

# دەردی گران

بەشــی ناســینی نامــەردی لــە کەســدا مــەردی نــابینم

لــە لاییکــی کــەڕوو گــەرمی نــەبێ دڵ ســەردی نــابینم

چ ڕوسپیەک بە ڕووسووری لە بۆتەی ئیمتحان دەرچوو

درۆ ناکــەم بــە وەجهــی راســتی ڕووزەردی نــابینم

لە کەندورەندی عالەم قەت مەپرسە گەر خیرەدمەندی

خــوا هــەڵناگرێ ڕەنــدم نــەدیوە کەنــدی نــابینم

لــە کــەس وردیم نــەدیوە تــا درشتی پــێ نمایــان بــێ

کەســێ بــرڕوێش دەکــا و لافــی دەقیقــە وردی نــابینم

گــەلێ کــەس دەستی چــا دەڕوا وەکو چــا ئــابڕووی ڕۆیــی

بــەڵام بــۆ دیــن وەکــو دنیــا بــە دەســت و بــردی نــابینم

ئەوەی عاریف بوو دەیزانی ئەمن چم دەکوت و لام باشە

دەڵــێم زاهیــد بــە دارا چــێ ئــەمن وەک بــەردی نــابینم

حــەریق دەردی گرانــە دەردی بــێ هاودەردیــەتی وا

لــە هــاودەردێ گــەڕاوم حــەیفێ هــیچ هــاوەدردێ نــابینم

## خەتی مووبەموو

لە سینەی چاکی خۆت وەک شانە خەتی مووبەموو بێنە
ئەڵێن تا غەیبەتە باسی جەماڵی ڕووبەڕوو بێنە
جزوبەندی کتێبی عومر و شیرازەی سەحیفەی دڵ
بە ڕیشتەی ئولفەتی جانانە گەر ئازار دەزوو بێنە
تەهارەتیان بە خوێنی جەرگە مەردانی ڕەهی مەقسەد
هەتا قەترێک لە چاوتا ماوە تۆش ئاوی وزوو بێنە
نەوەک مەیخانە خاڵی بێ هەتا پیری موغان ماوە
سەرم قوربانت ئەی ساقی گەلێ تینوم سەبوبێنە
کتێبی ئولفەتی جام و شەرابی جەرگی نامەردان
دەخیلت بم وەرە موتریب روبابت زوو بە زوو بێنە
دەهانی شیشە بەستە، سوحبەتی نا ئەهلە لەم بەزمە
موغەننی تۆنەوای ناکەت لەناو پەردەی گەروو بێنە
دەڵێن بەردی ئەجەل مینا شکێنە و تەفرەقە خێزە
"حەریقی" تۆش ئەگەر شێت نی دەسا باریێ کەدو بێنە

***

## میعراجی ئامال

لـه خزمـەت قازییـا لاریـم نییـە بـۆ سـەر چ جـای مـاڵم
چ حیکمـەت بـوو "ئیـشاراتی" نەفـەرموو بـۆ "شـیفای" حـاڵم
فیـدای تەشـریفی ڕێگـەت بـێ خـەراجی مـوڵکی جـان و دڵ
نیـساری تـۆزی بـەرپێت بـێ ڕەواجـی عـومری سەدسـاڵم
دەمێکــە چــاوەڕێی سـورمەی غوبــاری کــۆیی خوبــانم
بــە خــاکی مەقــدەمی تــۆ نــاییلی میعراجــی ئامــالم
لەبـەر تـەوقی وەفـا دەمکـوت کـە قـومری سـەروی بـالاتم
لەبــەر تــەنگی قەفــەس حــەیفێ دڕی جــەمعی پــەڕوباڵم
بــە حــوکمی خۆتــە ئیمــزا بــۆ مولاقــاتی شــەڕەفیابی
لەهــەر لا بــێ دەفــەرموی حــازر و موشــتاقی بــالاتم
لە خزمەت خان و سـەرهەنگ دا سیلاحم فـەوجی سـەربازە
دوعــا ســوڵتان و یاوەرمــە لــە بــۆ ســەرتیپی ئــەقوالم

***

# دڵی سەرکەش

بـــێ جێیـــە قـــسەکردنی بـــێ ڕێ و بـــەبێ جـــێ

بـــێ یاریـــدەیی یـــارم ئـــەمن نایەمـــە ســـەر ڕێ

وەک شـــەمعی ســـەحەر چـــاوەنواڕی نەفەســـێکم

کـەی بـێ لـە تـەرەف غونـچە دەمـێکم کـە دەمـێ بـێ

مـــەحرووومی حـــزووری مـــەدەنی و خـــاکی مەدینـــەم

بـــەم حاڵـــەوە قـــەت ڕێـــم نییـــە بێنـــی مـــەدەنی بـــێ

پـــەیکانی مـــوژەت بـــۆ ســـپەری ســـینە ڕەوان کـــە

نامـــەرد ئـــەوە بـــێ گـــەر لەبـــەر ئـــەو تیـــرە ببـــزوێ

موحتاجـــە بـــە مـــەودایی دەمـــی تیغـــی بـــرۆت دڵ

بینـــێ لـــە ملـم شـــەرت بـێ کـــە ئـــاییم نـــەبێ ئێـــستێ

ئـــەغیار و ڕەقیـــب شـــاد و ئـــەمن هـــەم دەمـــی فـــەریاد

یـــارەببی خـــودا کـــەی بـێ کـــە وەختـــی هـــەلی مـــن بـــێ؟

زۆرم دەکـــوت ئـــەی دڵ مەبـــە ســـەرکەس لـــە حـــزووری

زۆر موســـتەحەقی خـــۆیڕی، دەبـــا واتـــە بەســـەربێ

تـــۆبی و ســـەری خـــۆت عەبـــدێکی زۆر چـــاکە "حـــەریقی"

ئـــازادی مەکـــە ئـــاخری بـــۆ تـــۆ بەعەمـــەل دێ

***

## ورد و هەراش

عالەمێکـــە پـــڕ شـــەڕ و شـــۆڕ و نیـــزاع و ئیرتیهـــاش
ڕۆژگارێکـــە سەراســـەر میحنـــەت و پـــڕ ئیغتیـــشاش
کــەس نییــە بــۆ ئیــستراحەت ســەر بنێتــە ســەر ســەرین
کــەس نییــە ئاســوودە بــێ پــاڵوی لــە خــاری ئیغیتــراش
تــالبی ئیمــساکی دەرخــست ڕووبــەڕوو هاتۆتــە پــێش
ســاحێبی عیرفــان و دانــیش ســەربەزانو چــۆتە پــاش
بــۆ ســلووکی ڕێــی مــەعاریف پاڵــەوانیش نــا تــەوان
بــۆ تــەریقی جــەزبی جیفــە وەک یەکــە ورد و هــەراش
نــان و ئــاوی ئــەهلی دڵ هــەر غوســسەیە و خــوێنی جگــەر
دەســتی بــەرداوە لــە عــورزە تــالیبی نــانی بــەلاش
هــەر کەســێ دانگــێ شــعوری بــێ شــەعیرێکی هەیــە
ئەبلەبێ دەنگ بۆتە ساحێب ملکی شەش دانـگ و مـەعاش
گـەر بـە تـێڵا و زۆر نـەبێ رۆزی وەدەس کـەس ناکـەوێ
شاهیدە بـۆ و موددەعایـە حـوکمی قـازی و بـاش و جـاش

دین بەزایع چوو مەگەر بۆی رێک کەوێ پیاو ناگەهان

وەک کەلیموللا خودا کردیە دەلیلی سەنگ تراش

نەک وەکو قازی زەروری و وەک مەلای ناخوێندەوار

یا خەلیفەی کۆلەتاش و مورشیدی خۆهەڵتراش

یا وەکو من بەخت و تالیع یاوەر و یارم نەبوو

جێی موتالاو نۆرە دەرسم بۆتە دەورەی نۆبەئاش

وەک ئەرەستوبم، جیهانگیرم سکەندەربێ، نییە

جارێ بابا یە رەفیقم بێ وەکو وێڵداشی باش

***

## ئامالی ڕەقیب

موعتـــادی فەلـــەک داییمـــە هـــەر جـــەور و جەفایـــە

خۆخاســـسە لەگـــەڵ ئـــەهلی زەکایـــان بـــێ وەفایـــە

یـــارەببی ڕەقیـــب تووشـــی بـــەلا و دەرد و غـــەمێ بـــێ

بـــــەدو دەردە بنالێنـــــێ هـــــەتا ڕۆژی جەزایـــــە

بـــەو ڕیـــشەوە ئێـــستا کـــە ڕەئیـــسێکە لـــەلای خـــۆی

تـــــەزکیری کـــــە تـــــەزویرە لەســـــەدامی خەتایـــــە

بـــۆ ماچـــی دەمـــی ســـاڵێکە ســـوفی لـــە ڕەهـــن دا

ئیمـــانی بـــــەخت کـــــرد و شـــــکور ماچـــــی نەدایـــــە

زاهیـــد مەکـــە مـــەنعم کـــە دەکـــەم وەســـفی گـــوڵی خـــۆم

گـــوڵ غونـــچەیی مـــن لاییقـــە موشـــتەق لـــە ســـەنایە

هـــەر چـــەندە بەســـین تفڵـــی، شـــکور عـــاقڵی قوربـــان

تێـــی هەڵـــدە بـــە شـــەق ئـــەو کـــەرە هـــەر عـــەینی بەڵایـــە

هـــەر شـــوکری خـــودا بێنـــە بـــەجێ تـــۆ کـــە حـــەریقی

ئامـــــالی ڕەقیـــــب کـــــە هـــــەموو جـــــەور و جەفایـــــە

***

## دوکانی حوسن

بە قوربان ئێستە هیجرانت دەناسم
کەناری فیرقەتت بۆتە لیباسم
بەبێ دوکانی حوسنت موددەتێکە
لە بازاڕی رەواجا من کەساسم
موشەووەش بوو وەکو کاکۆڵەکەی تۆ
لەف و نەشری خەیاڵاتی قیاسم
بە تابووری بلوکی نوکی موژگان
شکا تەرتیب و نیزامی حەواسم
بە تیرێکت کە جەرگت پارەکردم
مەکە بەو بارە هەر من بوو خەلاسم
کە خاڵی لەعلی لێوت رەهبەرم بێ
لە خدری زیندە نابێ ئیلتیماسم
کەشک نابەم گوڵی ڕووی لالەرەنگت
ئەوا موحتاجی ڕووی لالەعەباسم

لەبـــەر تەعنـــەی عـــەوام ئەندێـــشە ناکـــەم
کــە مـــن عاشـــق بــە گـــوڵ غونـــچەی خەواسـم
بـــە شـــەمعی جـــەمعی روخـــسارت حـــەریقم
نەســـــیمی ئیلتیفـــــاتی تـــــۆ دەناســــم

***

## شیعری ئاودار

بێینـــە ســـەر باســـی نیگـــاری گـــوڵ عـــوزار
شـــۆخ و شـــەنگ و لالـــە ڕەنـــگ و چـــاو خومـــار
چـــاوی مـــەخمووری کـــە هـــەڵ بێنـــێ بـــەناز
دڵ لـــــەلای نامێنـــــێ ئـــــارام و قـــــەرار
پەرچــــــەم و کـــــاکۆڵی داوی دیـــــن و دڵ
گۆشـــــەیی چـــــاوی فریـــــوی ڕۆژگـــــار
دڵبـــــەر و خورســـــەند و شـــــیرین و لـــــەتیف
نـــیم نیگـــاهی شـــیبهی ئـــاهۆیی تـــەتار
لێـــوی لـــەعلی وا دڵـــی خـــستۆمە خـــوێن

جۆگەلـــەی خـــوێنین لـــە دیـــدەم دێتـــە خـــوار
رۆژوشـــــەو هـــــەردو مونـــــافین پێکـــــەوە
یـــاری مـــن جەمعـــە لـــەلای لـــەیل و نـــەهار
ســـینە پـــڕ ســـۆزە بـــە ڕووی نـــارینی نـــار
وەک تـــەنووری پـــڕ لـــە ســـۆز و پـــڕ شـــەرار
تـــەرفی ئـــەم شـــارە چ خۆشـــە بـــۆ بـــەهار
لایـــێ گـــوڵ غونـــچە لـــە لایـــێ لالـــەزار
بـــێ وەفـــایی هـــەر لـــە بـــۆ یـــار مایـــەوە
ئـــــاخری هـــــەربێ وەفـــــایی کردەکـــــار
کـــەس وەکـــو مـــن بـــێ بـــەش و مـــەئیوس نییـــە
بـــاغ وەکـــو مـــن زەرد نییـــە وا بـــێ ژومـــار
ئافـــەرین بـــۆ تـــەبعی ســـافت ئـــەی "حـــەریق"
بـــێ غـــەڵ و غـــەش ئێـــژی شـــیعری ئـــاودار

***

## باغی خەیاڵ

کە قەتلی خوێنی مـن زوڵفی کەچی کرد
نییە داخم ئیتر زوڵفی کە چی کرد
خەیاڵم کرد لە باغی خاڵی فەرمووی
هەتیو لاچۆ خەیاڵی خۆت لە چی کرد؟
لە خزمەت ئاسمانی حوسنی ڕووی تۆ
سەما کەوتە سەما گەردن کە چی کرد
بە تیری غەمزە جەرگت پارە کردم
تەماشای تیری موژگانت کە چی کرد
ئەگەر وەسفت بە "ما هذا بشر" کەم
پەشیمانم دەڵێم وەسفم بە چی کرد؟
خەیالاتی شەو و ڕۆژم لە شام و
نەهار و زوڵفت و ڕووی تۆ بوو هەچی کرد
"حەریق" سینەی کە پڕ دوخانی غەم بو
لە داغی "ئەحمەدی دوخانەچی" کرد

***

## مرواری سرشک

وەکو کاکۆڵی سەرشانی عەزیزم
پەراکەندە و پەرێشانی عەزیزم
دوچاوم پڕ لە مرواری سرشکە
لەبۆ لەعلی بەدەخشانی عەزیزم
لە تەندووری دڵم بۆی وەک تەنوورە
جگەر سوتاوی هیجرانی عەزیزم
هەمو ڕۆژێ لەبۆ تەسلیمی ڕۆحم
وەکو قوربانی عەزیزم
مەڵێن کوشتەی خەدەنگە یانە خەنجەر
شەهیدی تیری موژگانی عەزیزم
بە دایم مەست و مەخموورە لە بادەی
پێیاڵەی چاوی فەتتانی عەزیزم
لە فەننی دڵبەرییو دڵ روبایی
نییە ئەمسال و ئەقرانی عەزیزم
هیلالی نەو نەحیفی گۆشەگیرە
لە حەسرەت ماهی تابانی عەزیزم
وەکو شاهی جیهانم تا "حەریقی"
گەدای دەرماڵی دەربانی عەزیزم

***

# دڵبەری فیکری

قەمەر کەوتۆتە میزانی خەیاڵم موشتەری با بێ
لە عیقدی نەزم و نەسرم تالبی عیقدی سورەییا بێ
جەمالی دڵبەری فکرم لە خەڵوەتدا بوو تا ئێستا
بڵا با دڵبەر ئارابێ، قەبووڵی ئەهلی ئارابێ
لە دوکانی خەیاڵم بۆ عروسی دڵ غەزەل دێنم
گرانجانی بەکارنایە کەسێ سەودای لەسەردا بێ
لە موژدەی نەوبەهار و غولغولی بولبول لە دەوری گوڵ
وەکو قومری دەبێ تۆقی وەفای سەروم لە ملدابێ
نەفەس دەم، دیدە پڕ ئاو و سەماوەرسینە،جەرگ ئاتەش
کەلامم قەندە گەر ساقی لەگەڵ من ئارەزووی چا بێ
سەرم سەمتور و سینە ساز و ئەشکم تارە بەو شەرتە
بدا ساقی مەیی نابێ بڵێ موتریب بڵێی نابێ
لە دامێنی خەیاڵم دامەنێ گوڵ بچنە ئەی شاهید
بە شەرتێ شاهی "شەمسەددین" لە دڵما جلیوە ئارابێ
لە گەرمی لوتفی "مەولاوە" نییە سەردی لەمەولاوە

بــه ســـەرما ڕۆییـــوه ســـەرما، نییـــه بـــاکم بەســـەرما بـــێ

خـــەلاتی شـــاهی نـــەورۆزی نیـــشانەی ئاتـــەش ئـــەفرۆزی

نەســـیم هێنـــای بـــه دڵ ســـۆزی دڵیـــی ســـۆزی جـــەفا نابـــێ

ڕەئیـسه هــەور و تۆپـچی ڕەعـد و تـۆپ بـەرق و نیـزام بـاران

نەســـیم پێـــشرەو، تەلیعـــه تـــەرزە، فەڕڕاشـــی دەبـــێ بابـــێ

شـــــەماڵ ســـــەرتیپی تـــــەرتیبی غولامانـــــەی غولامانـــــه

جنـــووبی یـــاوەری فـــەوجی شـــەدە و دەســـماڵی والابـــێ

بەڵـەک بـوو کێـوو سـەحرا وەک دەڵـەک خـۆی دزیـەوە زسـتان

زەبیـستان ئیتتیفاقـەن چـون بـەری خـست هێـزی پێـی بـا بـێ

لـه دەنگـی ڕەعـد و ڕەنگـی بـەرق و ناڵـەی هـەور و گرمـەی بـا

کـەڕ و کـوێر بـەفری تـایین، مـەر هەناسـەی سـەردی پێمابـێ

له شەوقی گوڵ، لـه زەوقـی مـول، عەجـەب سەرخۆشـه ئـەهلی دڵ

دەوێــژن تاییفــەی خوبــان مەگــەر جەنــەت بــه دونیــا بــێ

حەجـەر هـەروەک شـەجەر نـاتیق بـه سـڕڕی قـودرەتی حـەق بـو

کەســـێ حـــاڵی ببـــێ حـــاڵی دەبـــێ گـــەر ئـــەهلی بینابـــێ

نیـــشانەی نیعمـــەتی عوقبـــا لـــه دونیـــادا هووەیـــدا بـــو

کەسـێ بـاوەڕ بـه مـن ناکـا لـه ڕەنگـی سـەوزە جویـا بـێ

عــەتای موتڵــەق بــه غــەیری خـالیقی حــەق بـۆ درەختــی ڕەق

بــه کــێ دەکــرێ هــەموو ســاڵێ شــکۆفەی ســەبزی پێــدابێ؟
نــەباتاتی زەمــین نــەوخێزو جــامی کــەیفی گــوڵ لــەبریز
لــە خــەو بێــدار بــوو نــەرگس هــات بــەخێربێ مــاڵی ئاوابــێ
بــە عــەزمی دەســت بۆســی دەســتە دەســتە هاتــە خزمــەت شــا
هــەموو مــەخووری نیــسبەت وەک کەســێ سەرمەســتی ســەهبابێ
وەنەوشــە بــۆ غــوڵامی خــاڵی خوبــان گــەردنی کــەچ کــرد
بــە وەجهــە وەجهــی وەک مــوئمین لەبــەر ســوجدە بــە ســیما بــێ
ســەفینەی فیکــرەتم ڕۆچــو دەفینــەی حیکمــەتی تــوش بــوو
سەلەف حیرزی خەلەف هـەر وەک سـەدەف بـو دوڕ موهـەییا بـێ
نمونــەی ئینقیــاد و سەرکەشــی بــوو ســەردی و گــەرمی
کــە مــوخلیس حــاڵی گــەرم و مــونکیریش دڵ ســەردە تــا مابــێ
"سیراجەددین" بــە نــووری حــەق بــە هــەر شەخــسێ بــەهای دابــێ
بــە شەمــسی ڕووی "حیــسامەددین" وەفــا کــا بــێ "زیبــا" نابــێ
بەســەر خــاکی وجــودی تالیبــان ئیکــسیری ئــەلتافت
مــسی قــەڵبی قــەڵب خــالیس دەکــا گــەر عەکــسی تێــدا بــێ
لــە دیباچــەی کتێبــی حوســنی عالــەم هــەر وەرەق لادەم
دەبیــنم مەبحەســی وەســفت لــە هــەر فەســڵ و لــە هــەر بابــێ
لەگــەڵ نەفــسی یەزیــد وەک بایەزیــدە هــەر دڵــێ بــۆ تــۆ

موتیـــع و ئـــەهل و دانـــا بـــێ، ســـەری تەســـلیمی دانابـــێ
بـــە نـــەحوی ســـەرفی دڵ تـــا زولفـــەقارت گرتـــە نێـــو چـــەنگت
وەکـــو "حەیـــدەر" لـــە فـــەتحی خەیبـــەرا شمـــشیری کێـــشا بـــێ
بـــە عیـــشقی شـــای "ســـیراجەددین" و شـــەوقی "بولوەفـــا" جانـــا
کـــەرەم فـــەرموو وەکـــو دێـــژن نـــە زانـــستم بـــەزانابێ
"حـــەریقی" ڕیـــشتەیی جانـــت فتیلـــەی شـــەمعی جانانـــە
لـــە بـــەزمی پیـــری مەیخانـــە کـــزەی دڵ بـــێ مـــەزە نابـــێ

***

## هەودایەکی خاو

بـــەنی ئـــادەم خـــودا وای کـــردووە ڕۆژێکـــی تـــا مـــاوە
سەراسەر عومری سـەرفی سـەرف و نـەحوی زەرفـی "تـا مـاوە"
مـــەداری تـــوولی ئوممێـــدم خـــەیاڵی گـــەردن و زوڵفـــە
بـــەڵێ سەوداســـەری عاشـــق لەســـەر هەودایـــەکی خـــاوە
بـــە ســـانی پەرچـــەمی ئاشـــوفتە ســـەرگەردان و ژۆلیـــدە
بـــە میـــسلی زوڵفـــی ســـونبول دڵ هەمیـــشە حـــاڵی شـــێواوە
هەوای نافـەی غەزاڵـەی ڕێـی خۆتـەن تووشـی خـەتای کـردم
بـە یـادی میـشکی زوڵفـی ڕووم لـە "چـینی" پەرچـەمی نـاوە
چـــراغی عـــومری عاشـــق بـــای فـــەنای هیجرانـــی لـــێ هـــەڵبوو
لـە فانوسـی "ئـەدەب"دا حیفـزی کـە یـەک دوو نەفـەس مـاوە
دەمێکـــە چـــاوەڕێی ســـورمەی غوبـــاری مەقـــدەمی یـــارم
لـــە کـــۆی خوبانـــەوە ئـــەمڕۆ نەســـیم تـــۆزێکی هێنـــاوە
کتێبـــی عیـــشقی مـــەجنون ئایـــەتی روخـــساری لەیلایـــە
لـــە ســـوڕەی یوســـفا دەرســـی جنـــونی ئێمـــە نوســـراوە
ســـەرم کاســـی شـــەرابی ســـوحبەتی کاســـەی دڵـــی غـــەیرە

لــه دەردی دوردی ئــەم جامــە پــەنام بـۆ ســاقی هێنــاوە
کەســێ فیتــرەت بڵنــدبێ بــۆ رەواجــی ســککەیی دینــی
خــەراجی میـسری قــەلبی خـۆی بـە حوسـنی "یۆسـفی"داوە
لەســەر ســەودای قومــاری شـاهی خوبــان "پیــری بورهــانی"
بــە چــەوگانی ئیــرادەت گــۆی ســەرم بــۆ بــازی دانــاوە
نمــای رۆح و حــەیاتی مــن بــە جیلــوەی ســاقییە بــاقی
نـەوەک وەک سـپلە بـۆ سـفرە لـە دوی نـان چـاوی پـڕ ئـاوە
بــە قوربانــت بــم ئـەی پیــری خــەراباتی جیهــان ئابــاد
بــە شــاهیدبە کــەوا رۆحــم لــە رەهنــی قــوربی تـۆ نــاوە
شــەهی مڵکــی یــەقین شاهنــشەهی دیــن پیــری بـا تــەمکین
ڕەئیــسی ئــەولییا رەحمــێ هــەتا دڵ ڕێــی نەبەســراوە
لــە دارول حــوزنی میحنــەت نـاجی یـە وەک پیـری کـەنعانی
بــە بــۆی پیــرا هــەنی یۆســف کەســێ چــاوی هــەڵێناوە
حوزووری تـۆ بەهەشـت، ئـادەم دڵ و ئـەهلی حەسـەد شـەیتان
بــە بــۆی دانــەی تەمــەع کێــشاویەتە نــاوداوی دونیــاوە
شــەرابی ســوحبەتت ئیکــسیری خــاکی مەعــدەنی رۆحــە
لــە کارخانــەی ســەعادەت لوقمــەیی لوقمــانی هێنــاوە
عــەدو بـا هــەر وەکـو عــەقرەب بـەکلکی نێـشی خـۆی دانــێ

شــوكر تــۆزێ حــەیای بــوو وا بــە چــاویا دیــارە داینــاوە
هــەتا گــوێی پێــوە بــوو مــونکیر لــە زەلکــاوی حەســادەت دا
هــــەزارێ کلکــــی بگــــرێ کــــەڵکی نــــاگرێ تــــازە خنکــــاوە
وەکــو پەروانــە بــۆ شــەمعی جــەماڵی تــۆ حــەریق ئــەم شــەو
چــــرای شــــۆقی بــــەکبریتی تەبیعــــەت خــــۆش هەڵایــــساوە

***

## عیشقی حەقیقی

عیــشقت کــــە حــــەقیقی بــــێ تالیــــب مەبــــە ئــــیللا کــــورڕ
هــــەم حــــەزرەتی لــــەولا کــــورڕ، هــــەم یوســــفی والا کــــورڕ
ئــــەو نــــوورە کــــە مەنــــشەئبوو، بــــۆ عاشــــقی مەبــــدەئبوو
تێفکــــرە لــــە ئــــەو نــــوورە مــــەعلوم و هووەیــــدا کــــورڕ
عیــشقێ کــــە بــــە قــــووەت بــــێ، مایــــل بــــە مــــرووەت بــــێ
نــــەم دیــــوە کــــە تالیــــب بــــێ، ئــــیللا کــــە تەڵــــەبکا کــــورڕ
عیــشقێ کــە بــە غــەوغا بــو وەک عیــشقی زولــەیخا بــوو
سەرگەشــــتەو و ریــــسوا بــــوو بــــۆ یوســــفی والا کــــورڕ
شــیرین کــە شــەکەر رێــز بــوو، بــۆ کــێ بــوو دڵ ئــاوێز بــوو

بـۆ خوسـرەوی پـەروێز بـوو، فـەرهادی هـەوا خـوا کـوڕ

کــچ مــاییلی وا لایــە وەک دامــی بــەلاّ وایــە

کـوڕ وەک کـوڕی شـا وایـە بـێ خـەوف و موحابـا کـوڕ

کـچ تـەبعی کـەچ و نـاقیس، کـوڕ تـەبعی تـەڕ و خـالیس

هـەم سـوحبەت و هـەم جـالیس خـۆش مـەنزور و سیما کـوڕ

کـچ زوڵفـی پەرێـشانە، کـوڕ پەرچـەمی ئەفـشانە

کـاکۆڵی بـە جەمعییـەت هـەم شـانی کـچە یـا کـوڕ

کـچ سـاحێبی لەرزانـە، کـوڕ مـەردە لـە مەیدانـە

کـوڕ هـەم دەمـی ئینـسانە، خـۆش مەشـرەب و گۆیـا کـوڕ

هـەر کـەس بـە تەبیعـەت بـێ، ئـەربابی مـرووەت بـێ

لـەم نوقتـە تەماشـا کـا، خـانم کـچ و ئاغـا کـوڕ

قامـەت کـە وەکـو نـەی بـێ، کـێ دیویـە لەگـەڵ بـەی بـێ

ئـەم نیـسبەتی ئەخلاقـە دەرحـەق بـە کـچە، یـا، کـوڕ

سـەد حـەیفێ کـە تـۆ "نـالی" بـەم پیرییـە منـداڵی

بـەم تـەرزە لـە عیـشق ئـەدوێی زیبـا کـچ و دیبـا کـوڕ

مـوێی کەلـە ڕووی کـوڕ بـێ، ڕێحانـەیێ نێـو باغـە

سـەد جـەرگی لـە بـۆ داغـە، سـاحێب خـەت و ئینـشا کـوڕ

بـۆ خـەڵوەتی تـەنیایی فیلواقیعـە کـچ چـاکە

ئـــەمما کەلـــە عیـــشق بـــدوێی، ئـــەدنا کـــچ و ئـــەعلا کـــوڕ

بـــۆ خـــەڵوەتی تـــەنیا کـــچ بـــۆ بـــەزمی تەماشـــا کـــوڕ

بـــۆ فاســـقی ڕیـــسوا کـــچ، بـــۆ عاشـــقی ســـەودا کـــوڕ

کـــچ وەختـــێ شـــکا ســـەدی، نامێنـــێ چ ســـەرحەددی

نەقـــسی نییـــەتی عـــەددی، مـــەحفووز و موبـــەڕڕا کـــوڕ

لـــەم تەبعـــە کەچـــە لادە، عـــومرت هـــەموو بـــەربادە

خـــۆی ســـاقییو چـــاوبادە، مـــەزبوت و موهـــەییا کـــوڕ

ئـــەم عیـــشقە مەجازاتـــە، ئـــەنجامی موجازاتـــە

غەوواســـی حەقیقـــەت بـــە، دوڕدانـــەیی دەریـــا کـــوڕ

هـــەر عیـــشقی حـــەقیقی بـــێ، وەک عیـــشقی "حـــەریقی" بـــێ

مـــەیلی بـــە دەقیقـــی بـــێ، بـــۆ مەعریفـــە تـــوللا کـــوڕ

***

## مەدینەی ئەمەل

تاریکە دڵم ڕەوشەنیێ شەمسی هیدایەت
نوقتەی دڵەکەم مەبدەئی هاتۆتە نیهایەت

ڕۆژم وەکو شەو وایە بەبێ شەمعی جەماڵت
سوبحی ئەمەلم چاوەنوواڕە لە عینایەت

نامەی عەمەلم ڕوڕەشە، وەک سەفحەیی قەلبم
غەیری ڕەشی ڕەنگی نییە خۆش حاڵ و حیکایەت

ئاهێکی جگەر سۆز و نیگاهێکی دڵ ئەفرۆز
بابێ لە تەرەف تۆوە بە تەئسیر و سیرایەت

بنەرقی بەڕقی دوژمنی دین، مونکیری بە دبین
کەی دێتە ئەسەر خەرمەنی هەستیم بەریعایەت

عیسیان بە ئیزاعەی دڵ و نیسیان بە ئیتاعەت
وەک جوتە برا سوحبەتییان گەیوەتە غایەت

"سەیید" سەنەدە، شاهیدی "سادیقمە" محەممەد
بێ سەیقەلی تۆ دڵ نییەتی دەرک و دیرایەت

ئەی پادشەهی مڵکی ویلایەت بە عەداڵەت

مــــەزڵومیی شــــەڕی نەفــــسم و هاتوومـــــە شـــکایەت

کەوتومەتــــە ژێـــــر دەســـــتی شــــەیاتینی نفوســــم

دەســـێ بـــدەرە دەســـتی شکەســـتم بـــە عینایـــەت

قوربـــان بـــە فیـــدای قـــاپی ســـەگی قاپییەکـــەت بـــم

وەبزانـــە ســـەگم ڕامگـــرە بـــۆ حیفـــز و حیمایـــەت

وەک تـــازی لـــەدوی ســـەیدەوە مـــن دەبمـــە توفـــەیلی

بـــەو شـــەرتە کـــەوا پـــەس نیگـــەریت بـــێ بـــە عینایـــەت

حەیفـــە ســـەگی قاپیـــەت لـــە زیبانـــا، بـــێ زمـــانی

بـــێ بـــاکم ئەگـــەر نـــا لـــە هـــەزار جـــورم و جینایـــەت

بـــێ تـــۆ شـــەم و هاتومەتـــە دەرمـــاڵی کـــەریمان

هـــەر جـــارە بـــەبێ تۆشـــە دەچـــن ئـــەهلی ویلایـــەت

"بورهـــان" وەکـــو "کـــەنعان" و "شـــەرەفکەند" کـــە میسر بـــوو

کـــردت بـــە مەدینـــەی ئەمـــەل و کەعبـــەیی غایـــەت

هـــەم شەمـــسی بـــە ئیـــسنادی و هـــەم قـــوتبی بـــە ئیرشـــاد

ئـــەو خەرقـــە بەســـە بـــۆ نـــەزەری ئـــەهلی کیفایـــەت

هـــەم حـــازر و هـــەم غاییـــب و هـــەم جـــەمع و پەرێـــشان

ئـــەم جەمعـــە نەقیزەینـــە لـــە تـــۆ بـــوو بـــە ریوایـــەت

بـــۆ بەحـــسی ســـیفاتت چ جـــەلالی چ جـــەماڵی

هەر عەقڵێ کە کول بوو هەموو کول بوو لە بیدایەت

سەد هەر وەکو "مەنسور" و هەزاری وەکو "شبلی"

جا ڕوکەشی دەرکن بە هەوای دەرک و دیڕایەت

سەردانێ لە مەیدانی مریدانی "حەریقی"

بۆ گوێی شەقێن چاکە خۆشت کوت بە کینایەت

***

## خزری ڕێگە

ئـــەی خـــزری ڕەهـــی زوڵەمـــەتی نێـــو ئـــاوی حـــەیاتم

بـــێ شەمـــسی ڕوخـــت ســـاکینی قـــەعری زوڵومـــاتم

ئەفـــــسوردەیی ســـــەرمایی حـــــوزوزو شـــــەهەواتم

ڕنجیـــــدەو و ئـــــازوردەیی دەســـــتی خەتـــــەراتم

دڵ بۆتـــــە پییـــــادە جڵـــــەوی ئەســـــپی هەناســـــەم

بـــۆ دەوری ڕوخـــی شـــاهی جیهـــان بەیـــدەقی مـــاتم

هەرچـــەند کـــە هـــەڵاتم وەکـــو بـــوم شـــومی وڵاتـــم

هـــــەر چـــــاوەنوواڕی کـــــەرەمی پیـــــری هیـــــراتم

گەرچـــی وەکـــو ســـەر دەفتـــەر و ســـالاری عوســـاتم

لـــــەم خـــــاکی دەری ڕەحمەتـــــە مەئمولـــــە نـــــەجاتم

قوربـــانی ســـەگت بـــم شـــەهی مەیـــدانی هیدایـــەت

وەک ســـالیکی بـــێ مەســـلەکی ڕێـــی هـــات و نـــەهاتم

زەنگـــی خەتـــەر و وەسوەســـە وا قـــەلبی قـــەلب کـــرد

هـــــەر مونتـــــەزیری گۆشـــــەیی میرئـــــاتی جـــــەلاتم

حـــەیران و سەراســـیمە وەکـــو بولبـــولی بـــێ گـــوڵ

ئاشـــــوفتەو و گیرۆدەیـــــی خـــــاری وەکـــــەناتم

تەعمیری دڵی باغی لە باغ چاترە قوربان

لەم چاوە منیش مونتەزیری مائی فوراتم

تا مەتلەعی کەنعانییە نێو چاهی زەمیرم

سەنگین بە سەعادەت بو تەرازویی نیشاتم

بۆ دەیدەیی یەعقوبی خیرەد یەک نەزەری تۆ

خاسییەتی پیراهەنی کردوە بە خەلاتم

زانیومە کە سوئی ئەدەبە شیکوە لە ئەحواڵ

چبکەم دەسەلاتم نییە بێ سەبر و سوباتم

تۆ "شەمس" و منیش زەرڕەیی بێ جلیوە بە قوربان

نیسبەت هەیە، عەیبی چییە جۆیایی بەراتم؟

با وەسفی هەمو زیللەت و ئەحواڵی ڕەزیلم

چون مونکیری تۆنیم وەکو سوڵتانی وڵاتم

بەم تەبلەیی عەتتاری خەیالاتە "حەریقی"

هەر بانگ کە، وەرە موشتەری بۆ شەهد و نەباتم

***

## عەسری خەزەف

ئــەی تۆبــە لــە دەس ڕۆژی فیــراق و شــەوی هیجــران

وەی ڕۆ لــە هــەرا و کەشمەکەشــی ســاعەتی حیرمــان

هـــەر خۆزگــە بــە پــارم لــە فیراقــی غــەمی یــارم

هـــەر چـــاوەنووارم لـــە نیگـــای دیـــدە غـــەزەلان

جــاران بــوو، کــە مــاڵم دەچــوو بــاقی بــوو "کــەماڵم"

ئــەم جــارە بــەجارێ ســەر و مــاڵم چــوو بــە تــالان

تــا ســونبولی زوڵفــت بــووە پــەرژینی گــوڵی ڕووت

نــەم دیــوە لــە دووریــشەوە عیــشوەی خــەت و خــالان

بـــۆ ســـەبزەیی نـــەوخێزی خـــەتی لالـــە روخـــانم

هـــەوری خەفـــەتم حـــازرە بـــۆ دیـــدەیی گریـــان

غونـــچەی ئەمـــەلم چـــونکە نەپـــشکوتووە ئــەم ســاڵ

بولبــول بــە دڵــم دێــژێ کــە ســەد خۆزگــە بــە ســالان

تــۆ تــاری ســەری زوڵــف و منــیش ئەشــکی بــە حەســرەت

خــۆش دێــن لەیــەک ئــەو ڕشــتەوو ئــەو دانــەیی مــەرجان

قــەترەی عــەرەقی شــەونمی بــەرگی گــوڵی ڕووت بــوو

وەمزانـــی کـــە مەرجانـــە لەســـەر لـــەعلی بەدەخـــشان

تا ڕیشتەیی زوڵفت بووە دامی دڵی مەیلم

مەجنونی دوجەیلم لە هەمو قەومێ هەراسان

جەرگم بە دەمی تیغی برۆت بێرە بە شەرتێ

بدروی بە تەلی زوڵف و بەتای سوزەنی موژگان

لەو چاکە کەوا دیومە کەوا چاکی دوگیرفان

گیرفانی دەروونم بە خەیاڵ پڕ بوو لە عیرفان

دڵ بۆیە سەوادی بووەوە زوو لە خەتی تۆ

منداڵ بوو کە فێر بوو لە خەتی لەوحەیی جانان

تا ئایەتی حوسنی لە خەتی مەسحەفی ڕووت خوێند

ساحێبی سەواد و خەتە ناتیق بوو بە قورئان

تەشریحی خەیاڵی فەلەکول ئەعزەمی وەجهت

تەسویری بەبێ گوێ زەقەنت نایەتە ویجدان

خاڵت لە ڕوخت نوقتەیە بۆ مەرکەزی عالەم

زوڵفی وەکو قەترەت بەکەشش هاتنە جەولان

بۆ مەتلەعی بورجی قەمەر و شەمسی جەماڵت

کەوتومە رەسەدخانەیی نێو چاهی زەنەخدان

وەک مەنعی منی کرد لە تەوافی حەرەمی ڕووت

سا ڕەببی لەئیمانی کە سەرداری لە ئیمان

بــــازاڕی جـــەهل گـــەرم و هونـــەر ســـەردە ڕەواجـــی
عەســـری خەزەفــە حەیفــە گوهـــەر بێنییـــە مەیـــدان
هەریـــەک پـــەلی فرزەنـــدێ دەژی شـــیعری حـــەرقی
تــۆ بۆچـــی لـــە کـــیس خــۆتی دەدەی موشـــتەری نـــادان

***

### کەوای غەزەل

تـــــاڵ و شــــیرینی زەمانــــە بــــە مــــەزاقت نابـــێ
چـــا نییـــە ســـاقی بـــدا بـــادە و تـــۆ بڵێـــی نابـــێ
بـــە زوخـــاڵی جگـــەر و دودکەشـــی ئـــاهی ســـینەت
هـــەر بــە جۆشــی دەبــو چــا بێــت و دەمــی کێــشا بــێ
ســـاقی جـــامی کـــەرەم و دەوری عـــەتای شـــیرینە
بـــا بەتاڵیـــــشی بـــــدا، ڕووح لـــــەلات بێجابـــــێ
پیـــری مەیخانـــە دەڵـــێ نـــەزم و مـــەقامت ئەمـــەبێ
هـــەر کەســـێ دوردی نـــەبێ ســـاف و گـــەوارا نابـــێ
نەخـــشی نامـــەی قەڵـــەمی قـــودرەتی ئیبـــداعی وجـــود
زشـــتی تێـــدا نییـــە گـــەر تـــۆ نـــەزەرت زیبـــا بـــێ
بــە کەمەنــدی غــەمی دونیــا کەســێ خــۆی پێــچا بــێ
موتڵـــەقی قەیـــدی تەکالیفــە کــە خــۆی پــێ چــا بــێ

جلیـــوەیی ســاقییو نەشــئەی مــەی و لەهجــەی موتریــب
فـــەرەحی مەجلیـــسە تـــا جـــامی ئـــەدەب نـــەڕژابێ
سەرخۆشــی چــاوی ئــەوی مــەکرە لــە ســرکەی ئــەبرۆی
قەنــدی لێــوی مەزەیــە مەشــرەبی تــۆ گەرچــا بــێ
مــن لەبــەر چــاوی گــوتم بــۆ مــەزە چــا بــوو لێــوت
ئــەو دەڵــێ جــامی مەیــە، چــا نییــە بــۆ تــۆ نابــێ
بــێ نەواکــەی بــە ســەدای کــرد و گــوتی گۆیــا بــێ
بــە ڕەزای پیــری موغــان موتریــب ئەگــەر گۆیــا بــێ
ئــەوی خــامی تەمەعــە کەوتۆتــە حــاڵی جــاوی
چــۆن لەبــەر ڕیــس و گوریــسی لــە غــەزەل جۆیــا بــێ
حیکمەتــە شــیعری مــن و دەوڵــەتی ئــەهلی ئیمــساک
وەک تەلەســمێکە کــە ڕێــی مەســرەفی بــۆ نەشــکابێ
گەرچـــی دەردی ســـەرییە تـــولی کـــەلامی خـــەڵکی
مــن کــەوا بــێ غــەزەلم چــاکە کــە ســەر تــا پــا بــێ
بــۆ کەســێ چــاکە ســەفینەی غــەزەلی بــەحری "حــەریق"
گەوهــەری ئەشــکی هــەموو ڕەشــکی دڵــی دەریــا بــێ

***

# بێ وەفایی گوڵ

عیلاجـــی دەردی بـــێ دەرمـــانی مـــن هـــەر لـــوتفی جانانـــە
بـــەڵێ ئـــەو خـــۆی حەکیمـــە لوتفەکـــەی دەرمـــانی دەردانـــە
مـــەلول و زار و بیمـــارم بـــە ســـەد عیللـــەت گرفتـــارم
خـــودا رەحمـــێ بـــە حـــاڵم کـــە، کـــە عەیـــشم عـــەینی نوقـــسانە
عـــەجاییب مەجمـــەری ســـینەم بەســـۆز و تـــابش و تابـــە
وەکـــو قـــومری دەناڵێنـــێ دڵـــەی مـــەحزون و دێوانـــە
لـەلای خـۆم تـەبعی عـالیم بـو، لـەلای خـۆم فکـری "نـالیم" بـوو
ئەمێـستا شـیعری بـێ مـەعنام دەڵێـی وەک جیـسمی بـێ جانـە
لـــەلام بـــێ ســـاقیی ســـادە کـــە پێـــی بـــێ ســـاغری بـــادە
کـــە گۆشـــەی چـــاوەکەی بـــادا دڵـــم دینێتـــە جولانـــە
کووانـــێ مـــوتریبی خۆشـــگۆ، کووانـــێ ســـاقی دڵجـــۆ
بـەبێ نـەی نەزمەکـەم سـستە، بـەبێ مـەی دڵ کـە حەیرانـە
دەنـــاڵێنم وەکـــو بولبـــول لـــە داغـــی بـــێ وەفـــایی گـــوڵ
رەوانـــە نـــەزمی وەک دوڵـــدوڵ وەلـــێ خـــاتر پەرێـــشانە
بـــە مـــەجموعی وەرە ســـاقی بنیـــشین پێکـــەوە ســـاتێ
دڵـــی زارم پەرێـــشانە وەکـــو زوڵفـــت کـــە پەخـــشانە

وەکو شەعری لەف و نەشرت هەمو شیعرم موشەووەش بوون
هەتا بیێم و دوو سێ شیعرێ بڵێم بۆ ئەم جەنابانە
دڵا تا کەی بەبێ هۆشی دەنۆشی مەی بە خامۆشی
لە گۆشەی غەم هەڵستە وەختی سەیرانی خەیابانە
عەجایب مەدرەسەی ئێمە بە بەزم و رەزم و ئاهەنگە
ئیلاهی بەرقەراری کەی تۆ ئەم بەزمی فەقێیانە
جەنابی زاتی "مەولانا" فەریدی دەهرە ماشەڵڵا
وەحیدی عەسرە لەم عەسرە بە عەینی عەینی نوعمانە
لە هەیئەت دا، لە حیکمەت دا، لە ئادابی تەریقەت دا
لە ئەحکامی شەریعەت دا، لە مەنتیق دا دوڕ ئەفشانە
جەنابی ئەم زهووری بو، زەهاوی ناویش ون بوو
نەزیر و شیبهی "مەعدومە" میسالی غەیرە ئیمکانە
زبانی من کلیلە بۆ کلیلی بابی ئەم مەدحە
ئەگەرچی فیلمە سەل فەتتاحی بابی عیلم و عیرفانە
"حەریقی" شیعرەکانی تۆ هەموو وەک مورغی بێ باڵن
لە عیشقا باڵییان سووتا بە میسلی باڵی پەروانە

***

## چاوەڕێی موژدە

چــاوەڕێی مــوژدەی نەســیمم تــا لــە گوڵــشەن دێتــەوە
بەڵکـــە فـــەرمایش بکـــا گـــوڵ، بولبـــولم بـــا بێتـــەوە
وا وەعیـــدی بـــەفری زســـتانی فیراقـــت کەوتـــە دڵ
مــەر بــەبای وەعــدەی ویــساڵت کێــوی دڵ ڕەش بێتــەوە
میروەحــەی زوڵفــت لــە دەوری ئاتەشــی ڕووت بــێ، چــلۆن
ئــاگری عیــشقت بــە ئــاوی چــاوی مــن دەکوژێتــەوە؟
سووچی زوڵفت بوو کـە پەروانـەی دڵـم ڕووی کـردە ڕووت
ئـــاگری وەســـڵی شـــەم و پەروانـــە شـــەو دەگرێتـــەوە
خــەتتو مــۆری زوڵــف و خاڵــت حوججــەتی مڵکــی دڵــە
نەقــشی ئــەو مــۆرە بــە ئــاوی "خــوڕ خــوڕە" ناچــێتەوە
دڵ لــە ترســی چــاوەکەت رووی کــردە میحرابــی بــرۆت
ئێـــستە بیـــستومە لـــە چـــینی زوڵـــف جێـــی نابێتـــەوە
کێــوی هیجــرت خــستە ســەر شــانی دڵــم پێــی خــستووە
تــا نــەگا دەســـتی بــە زوڵفـــت زەحمەتــە هەســتێتەوە

سەد کەرەت خستتمە گێژ و مەهلەکەی بەحری فیراق
ئاخری موژگانی قوللابت دەرم دێنێتەوە
مەزرەعەی میهرو مەحەببەت توخمی وەسڵی شین نەکرد
گوڵ بە شادی دادەچێنم خاری غەم دەڕوێتەوە
خۆت دەزانی موددەتێکە گەردی پا ماڵی جەفام
کەی وەکو نەقشی قەدەم سەر دێنمە ژێر پێیتەوە
دڵ ئەوا کەوتۆتە زیندانی غەمت قوربانتم
تایەکی زوڵفت بنێرە بەڵکە بۆم دەربێتەوە
تۆ خودا تاکەی لە تاریکی شەوی هیجرانی تۆ
دەستە و ئەژنۆ دابنیشم، ڕەببی کەی ڕۆژ بێتەوە
بێ ئیشارەی حیکمەتول عەینی شیفات نایێ شیفام
خۆت دەزانی زامی دووری سەختە خۆش نابێتەوە
فکریَ من چونکە دەقیقە عاشقی قەددی ئەوە
موو لە موو گیراوە چبکەم لێک جوێ نابێتەوە
زەخمی دڵ بێ مەرهەمی وەسڵی بە ناسۆر کەوتووە
ئەی "حەریق" باسی مەکە تۆ خوا بڵا نەکولێتەوە

***

## هەزەیانی ناسازی

ئــەی جــەنابی ســەییدی عــالی نەســەب کــەی ڕەهــرەوێ

عــــــەرزەوو دەردی دەوام و بــــــێ دەوام دێنێتـــــەوێ

بــۆ حـــزووری پیـــری کامـــل عـــاریفی دانـــایی ڕاز

شەمـسی ئـەفلاکی هیدایـەت نـەجمی ڕێـی هـەر شـەبرەوێ

خـۆ مەسـەللەم گـەر لـە غاییـب دەسـتی پیـر کۆتـا نییـە

کـەی دەبـێ دەسـت و دڵـی پیـرێ لـە بـۆ مـن ڕێ کـەوێ

ڕۆژ و شــەو غــەرقی خــەیاڵم بــێ ئــەنیس و بــێ نــەدیم

چــاو نــەماوە تــا بڵــێم قــەت خــەو لــە چــاوم ناکــەوێ

خــەڵکی گــەر دەســتی بــڕا مــن چــاوی ڕێــی دەســتم بــڕا

یەعنی چاو مەبرە لە دەست کـەس رزقـی دەسـت و پێـت نـەوێ

گــەر هــەزار پــێ بــێ و هــەزار چــاو بــێ بــە قــووەی بــازوویی

غــەیری مەقـسومی نەسـیبی کـەس وە دەسـت کـەس ناکـەوێ

وەم دەزانــــی تــــۆ لــــە خزمـــەت شـــێخ و قـــازی لێـــرەدا

مەلجەئــە بــۆ موســـتەمەندی دەربـــەدەر لێـــرە و لـــەوێ

بــۆ قـــەزای حاجـــەت لـــە تەنگانـــەی زەروری بـــەو کەســـێ

لێـــی بقـــەومێ ئێـــوە دالـــدەن گـــەر زەرورێ هەڵکـــەوێ

ئێـــستە وەک زانیومـــە هـــەر کـــەس ڕوو لـــە دالـــدەی ئێوەکـــا

خەرمـــەنی هەســـتی بـــە باچـــوو ڕۆژێ ســـەد دالـــدەی دەوێ

پـار لـە "پـشتەپ" وا شـەکی بـوو دەفعـی سـەد وەهمـی دەکـرد

زەننی ئـەو سـاڵ بـۆ یـەقین چـوو ڕەفعـی شـەککیش بـوو لـەوێ

پـــار و پێـــرار بەحـــسی فیتـــرەی بـــەردە ســـپانیان دەکـــرد

بـــە قـــسە رابـــرد و قـــسەش مـــەعلوم زەکـــاتی ناکـــەوێ

تـــا "مەلاحوســـێن" بـــۆ خـــەیاڵی پـــشکەڵێکم لـــێ دەکـــرد

نـــەم دەزانـــی دەوڵەمەنـــد بـــۆ شـــیاکە ڕۆحـــی ناســـرەوێ

ئێـــستە گـــەر مـــوڵلا مەجیـــد ســـوور باشـــە لـــەو دەوروبـــەرە

وەک دەڵـــێن بـــێ دەوڵەتـــە ئـــەو پـــشکەڵی ڕێ ناکـــەوێ

ڕەســـمی ناســـازی وەیـــە هـــەزیانی ناســـازی هەیـــە

گـــەر لـــەبێ تـــامی لـــە تـــام و خـــوێی قـــسەت دڵ هـــەڵگووێ

ســـائیلی لامەزهـــەبی بـــێ ڕێ قـــسەی بـــێ جـــێ دەکـــا

وەک ئـــەمیر فـــەرمووی زبـــانی ببـــڕە تـــا لـــە زبـــان کـــەوێ

نوقتـــەیی شـــەک بـــۆ بـــەیانی پـــشکەڵی مـــوڵلا حوســـێن

چـــونکە ئیـــشکالە لەبـــەر ئـــەم فەحوایـــە کوشـــتی دەرکـــەوێ

***

## لاله عوزاران

ئەم تاقمە شیرینە لە مەکتەب کە دییارن
جەللادی دڵی عالەم و ئاشوبی دییارن
شیرین سەنەم و دڵبەر و فەتتان و عەیارن
خاڵی لە خەلەل جوملە وەکو نەقدی عەیارن
شۆخن، هەمو شەنگن، هەمو گوڵ ئاتەشی ڕەنگن
ئامادەیی جەنگن، هەمو سەییادی شکارن
ئاهوڕەوش و مەهوەش و شیرین حەرەکاتن
ناسک بُەدەن و سیم تەن و لالە عوزارن
گاهێ دەبنە ڕەهزەنی ئیمانو دڵ و دین
گاهێ وەکو سۆفی هەموو مایل بە کەنارن
گاهێ دەنوێنن ڕوخ و ڕوناک دەکەن ڕۆژ
گاهی یەد و زولفەینی سییا وەک شەوی تارن
زولف و ڕوخ و پەرچەم لەگەڵ ئەگریجە و کاکۆڵ
ئیعلانی حەربیانە کە ئیسلام و کوفارن
خاڵ و خەتی بێ حەد کە هەموو جەمعە لەسەر خەد

وەک زەنگــی لەگــەڵ حــوور و وەکــو زاغ و عوقــارن
کــێ حــەددی هەیــە تــالیبی گــەنجی روخییــان بــێ
یــەک یــەک کــە هــەموو ساحێبی زوڵفــی وەکــو مــارن
مومتــازی جیهــانن هــەموو هــەم مونتخــەبی شــار
ئاغـــا لـــەرو بـــەگزادە و ئەســـناف و کوبـــارن
وەختــێ کــە دەکــەن جلیــوە لــە مەیــدانی حوســندا
وەک کـــەبکی خـــەرامان و وەک ئـــاهوی تـــەتارن
مـــەوزون و لـــەتیف و خـــۆش و خورســـەند و ســـەعیدن
مـــەتبوع و رەشـــیدن بـــە ئوســـول و بـــە ویقـــارن
وەک مـــوعجیزەیی موســـتەفەوی وانـــە لـــەلای مـــن
بـــەو لـــەعلی نمـــەک رێـــژە کـــەوا شـــەکەر ئـــەبارن
هـــەر ئەحمـــەد و مـــەحمودە خـــەیاڵی شـــەو و رۆژم
لـــەم مەکتـــەبی روشـــدییە کـــەوا پـــڕ لـــە نیگـــارن
هەرچـــەندە کـــە ســـوڵتانی جیهـــانن لـــە حوســـندا
بـــۆ شـــبری رەقیـــبم حەســـەن و حوســـێنی هـــەژارن
بـــەم هەیئـــەتی دەروێـــشییە رازیـــم و رەقیبـــان
دەســـتم لـــە یەخـــە ناکەنـــەوە چـــەندە شـــەڕارن
عـــاریز بـــوو لەســـەر عاریزییـــان زوڵفـــی پەرێـــشان

بیعەینی دەڵێی حاڵ و مەحەڵ، لەیل و نەهارن

پەیوەستە وەکو دەستە گوڵی باغی جینانن

وەک غونچەیی نەشکوفتەیی نەورۆز و بەهارن

ئەمما لەگەڵ ئەم حوسنە نییە حوسنی وەفایان

حەیفێ کە لەسەر رەنجی دڵی عاشقی زارن

پارەی جگەرم کردە کەباب و مەزە بۆیان

تا دیومە کەوا ساحێبی دوچاوی خومارن

لەوحی دڵییان سادە لە میهر و لە وەفایە

بێ میهر و مەحەببەت هەمو بێ شەرت و قەرارن

هەرچەندە کە بێ تالیع و بەدبەختە "حەریقی"

ئەشعاری بە ئیشعاری عەجەب پڕ لە شیعارن

***

## پیرەکەی بورهان

پیربووم و ژیر نەبووم بۆ تەجرەبەی کاران
بارانی فرمێسکم باراند لەدوی یاران
سەرتاپام شین کرد بۆ سەوزەی رووی گوڵزاری
ئاوی چاوم سووربوو، بۆ سەروی جۆباری
لە خەوی غەفڵەتا هاتمەوە بێداری
دیسان وا چوومە سەر شیوەن و سەرزاری
تۆ وەنۆشی سوحبەت و رازی شەوی وەسڵت
تو وەنێش فیرقەت و زاری رۆژی فەسڵت
بە پەیکانی موژەت چەند جارت پێکاوم؟
لە میحرابی ئەبرۆت بەستیم و گیراوم؟
تۆ ئەگریجەی خاوت، تۆ زوڵفی لاولاوت
بەبێ دانەیی خاڵت مەمخەرە نێوداوت
بە پەرژینی زوڵفت ڕووی گوڵت شاردەوە
دڵم نارد بە دیاری، تۆ بۆ چیت ناردەوە؟
یا خودا بێ قەزابی، لوتفی تۆ هەروایە؟
درێغم لێ دەکەی بۆ تاقە هەودایە؟
تۆ جامی لێو ڕێژت، تۆ و غەمزەی خوێن ڕێژت
تۆو دەست پارێزت بابەس بێ گورێزت
تۆو ریزەکەی رازت، تۆو چاوەکەی بازت

تۆو تیرەکەی نازت، بەس بێ گیروگازت
لەبەر جلیوەت مەرم نیقابی رووت لادە
لەبەر عیشوەت مەرم چاو پیاڵەی بادە
ئاورێکی لێ وەدە، حەیاتم تازەکە
جەرگت پارە کردم بەو تیرە تازەکە
بە وەعدەی خیلافت گۆی سەرت شکاندم
بە چەوگانی زوڵفت دڵت لێ ڕفاندم
تۆو تاریکە شەو، هیجرانی چەند ساڵم
تۆو ڕۆژی رووناک، کۆچی ماڵەوماڵم
تۆ باڵای عەرعەرت، زوڵفت لاولاوکە
تۆ نیگای دڵبەرت جارێکی لێم لاوکە
تۆ دەروونی گەرم و تۆو هەناسەی سەردم
تۆ دڵەی پڕ دەرد و تۆ روخساری زەردم
لە سەرشانی دڵم باری غەم خوار مەکە
تۆ ڕاستی باڵاکەت، شەدەکەت لار مەکە
ئەمجا تۆبەی عەکسی تەجەللای سیفاتە
ئەمجا نۆبەی جلیوەی جامی خۆش سەفاتە
وەک خەتی میشکینت تا کەی پەرێشانی؟
وەک پەرگاری زوڵفت تا کەی سەرگەردانی؟
ڕوو زەردی ئیشراقی خورشیدی جەماڵم
شەرمەندەی بارەگای زوڵف و خەت و خاڵم
ئاوارەی وەتەن و غەریبی کۆی یارم
میحنەت زەدەی دەستی رەقیب و ئەغیارم

تـــۆ کەعبـــەی مـــرادت، قیبلـــەی دنیـــا و دیـــنم
جـــاریٚ دەرکـــەوە بـــا باڵاکـــەت ببیـــنم
مـــەقامی عاشـــقان ســـەدای قـــەد قامەتـــە
بـــە نـــەوای حـــەزینم راســـتی قیامەتـــە
بـــە شـــیٚوەی شـــیرینت ســـەد فـــەرهاد دڵ کەیلـــە
هـــەزار مـــەجنون ســـەودای زوڵفـــی وەکـــو لەیلـــە
بـــۆچ هـــەر مـــن مـــەخمووری بـــادەی دیـــدەی مەســـتم
یـــا هـــەر مـــن سەرمەســـتی جامەکـــەی ئەلەســـتم
لـــەلای خـــۆی حـــەریقی شـــەمعی ڕووی خوبـــانم
گیـــرۆدەی زنجیـــری پیرەکـــەی بورهـــانم

***

# شێوەی هەورامانی

## شای شەرەف کەند

جەسووب سەحەردا دیم غونچە دەمێ

نە پەردەی عیسمەت نما نا چەمێ

وە سەد نەزاکەت دەهەن وازمە کەرد

وەیەک ناز ئیزهار سەد نییاز مەکەرد

دەماغ نیسبەت موعەتتەر کەردە

گرد وەجهە توغرایی موعتبەر بەر بەردە

گوڵ چون ساحێب دڵ گردین دییار بێ

وە هەوای فەیزش نە ئینیتزار بێ

لا جەمێ کەمێ وەلاومە کەردی

نەجام گوڵ دا گوڵاو مەکەردی

پەی غونچە غونچەی ئەو نازک نەوگوڵ

گیان نشت نەعازاو، دڵ شین سەرچڵ

وە سەر پەنجەی ناز نیقاو هەڵداوە

ئاهرێ نە تۆی جەرگەم وەرداوە

شیم وە خزمەتش وە ڕووی شەرمەوە

وە دوعا و سەلام لەفز نەرمەوە

جە ڕووی ئیلتیفات جواو سەندەوە

دڵ نە داغ و دەرد هیجران سەندەوە

وە دیدەی تەحقیق چون تا موڵ کەردم

جەو بۆ جەو نیسبەت تەحقیق ئاوەردم

تۆمەز یەنیشان بۆی کۆی کەنعانەن

نەسیم ئاوەردی "پیر بورهانەن"

بە بۆی پیراهەن یۆسف نەژادەن

پەرێو چەم کوران کەعبەی مورادەن

ئەو بۆ موخلیسان یەعقوب ئاسا کەرد

مەنکیران گردین دەس وە دوعا کەرد

سەفایێ پەی دڵ، زیبایێ پەی دین

ئەربۆها جەلای شاە شەمسەددین

دەک نەسیم فیدای سۆزەی راهت بام

یاپیر تۆیچ فیدای سۆز راهەت بام
قووەی بیناییم وەگەرد پاتەن
دیدە و بیناییم سەرگەرد راتەن
ددان جە سوحبەت ئەغیاران کەندم
چون وە دڵ دڵبەند شای "شەرەفکەندم"
بەشق "بولوەفا" شای وەفاداران
سەر حەلقەی گردین نازک نازداران
رەحمێ چەنیم کەر جەهەر حاڵەتێ
نەگێج عیسیان، هەر جەهالەتێ
ئەر رەحمێ نەکەی وە جەستە و حاڵم
وەداغ عیسیان دەروون زوغاڵم
چون پیردانا "مەعدوم" مەحرووم
فەرمایش کەردەن فەردی خۆش مەفهوم
"ساقی ئامانەن نەشو جەبیرت"
"فەریاد رەسیم کەر تۆ بەشقی پیرت"
پیر رەوشەن دڵ منیچ دەخیلم
ڕاگە گوم کەردە و وێڵ و زەلیلم
ئێستە وە هەرحاڵ پڕ خەجاڵەتم

خــــــاكم وەســــــــەربۆ پــــــەی قییامــــــــەتم

پــــــەی دڵ وەشـــــی وێـــــم گاگـــــا مواچـــــۆم

ئـــەر ســـەد رەنجـــەرۆم ســـەگی قافڵـــەی تـــۆم

"حـــــەریق" كافییـــــەن پـــــەی دنیـــــا و دیـــــنم

ســــەگی ئاســــتانەی شـــــای "شەمـــــسەددینم"

***

## سەودایەکی سەقمونییا

عیلمــی جــەلب و کەســبی دونیــا بۆتــە ئــەجزای کیمییــا
بــــۆ منــــی ســــەودازدە ســــەودایەکی ســــەقمونییا
هــاودەرس بــوم مــن لەگــەڵ زاهیــد لــە دیباچــەی کتێــب
مــن نەگەیمــە فەســڵی تــەزویر ئــەو چــوو بــۆ بــابی رییــا

****

## ناپیاوی خەڵکی

عــەزیزم تــۆ دەزانــی مــن لەبــەر چــاوت وڕووگێــژم
لەبەر نـا پیـاوی خـەڵکی تێدەگـەی موحتـاجی گـۆی درێـژم
ســووار نــیم و پییــادەم چــون دەبــێ وەســڵ و مولاقــاتم
وڵاغ دەس ناکەوێ هەر بـۆ تەبـەڕڕوک خـۆی سـەر ئاوێـژم

****

## بەردی زەلام

چۆن بەسەرکەم زەرفی ئـەو قەومـە دڵـم بەسۆی نەیـە
جـامی عەیـشی ئـەکل و شـوربی پاکییـان بەسـۆینەیە
خۆی لـە قورِنـێ هەرکەسـێ ئـەمرۆ لـەنێو قـورِدا نـەبێ
دەس لە خۆی بـەردا کەسـێ بـەردی زەلامـی پـێ نەیـە

****

## مانگی موبارەک

لەگـەڵ مـانگی موبـارەک بـێ قـەزابێ سازیـشم نابـێ
لـە تـەکلیفی ئـەدای بـێ موڵـەتی گونجایـشم نابـێ
حەکیمانـە قـەراری چـا نەفـەرموی گـەر بـە شـیرینی
ئەوەنـدەم تاڵـە قـەت رۆژێ ئـەمن ئاسایـشم نابـێ

****

## بادانەوە

کاغــەزی وا زۆر دەهــاتن زوو لــە هەورامانــەوە
وەک گــەڵا تــاڵو هــەموومان خــستە ئاگردانــەوە
دوێنێ دەتگوت یۆسفی سددیقی میسری دین ئەوە
ئــەمڕۆ باتــداوە، چ عــەیبێکی هەیــە بادانــەوە؟

****

## کاکی سەردەشتی

هەروەکو بیستومە بەینێکە لە ئەم بەر ئەم بەری
بۆ مەلای "مزگەوتی سوور" وا چاکە تۆبی لەو بەری
بێ لە حاشا بو لەگەڵ من مەحکەمەی قازی دەچوو
کاکی سەردەشتی بە تەڕدەستی وەسەر جێگا پەڕی

****

## دوپشک

بــه پــشکێ رازییــه قــازی لــه هــه‌رماڵێ کــه دوو پــشکه
له ماڵی خۆی له بۆ خه‌ڵکی هه‌میشه حیسسه دوو پشکه
بــه‌ڵێ، "مــونعیم" ده‌بــێ وابــێ خوداکــا مــاڵی ئاوابــێ
نه‌وه‌ک خه‌ڵکی که ماڵیان زه‌هـری مارونێـشی دوپـشکه

****

## ئه‌ربابی مه‌عنه‌وی

بابــێ کــورێکی بــوو، چ کــوڕ، ئــه‌ربابی مه‌عنــه‌وی
ده‌یکــوت لــه ڕوی نه‌ســیحه‌ته‌وه داییمــه‌ن بــه‌وی
وه‌ک جـه‌رده بـی، ده ڕۆڵـه لـه عـه‌مری منـت کـه‌وێ
نــه‌ی ده‌یتــه‌وه بــه مفتــی ئه‌فه‌نــدی گه‌له‌نبــه‌وی

****

تاڵ و شیرین پێکەوە ئەم دیوە چابێ چا نەبێ
هەر کەسێکی هەم نشینی چانەبێ، پێت چا نەبێ

****

کوتم بۆ سەم دەوێ ڕووی خۆم بە ئاوی ڕووت گوڵاو، ناکەم
کوتی بۆ سەت دەوێ شێتە منیش ڕووی خۆم گڵاو ناکەم

****

لە عوزرا بوو مەلا بۆیە جووابی دا کوتی نادەم
وڵاغ دەس ناکەوێ عەیبی نیە چش گەر منیش پیادەم

****

سووواری مەرکەبی فکرم لە دەوری مڵکی مەحاڵ
سووواری تەوسەنی هیممەت نەما "قحط الرجال"

****

هەر بە دەستووری مەلای لاسوور، وەها کەوتۆتە سوور
وەی دەزانی لێی دەخەم گەر بچمە سەر "مزگەوتی سوور"

****

ئیحتیاجیم کەوتە "سۆما" چومەوێ حەتتا ئەوێش
ڕێی نەدام و جێی نەکردم ئەی خودا "این المفر"؟

****

موجازی کرد، مەجازی کرد، جەبەی کـردو جبـەی لـیٚ کـرد
قەباڵـەی ئەسـڵ و فـەرعی خوێنـد قـەباییل تـا بڵـێن جـسنە

****

سـیٚ کـەس بـە تەڵـەب بـوون، لـە تەڵـەب چـوونەوە جـاریٚ
رابـــورد وەتەڵـــەب بێنـــەوە تـــا فەســـڵی بـــەهاریٚ

****

ای کاش هرد و گوش من احول بودی چوچشم
تاهر چەگفتی ازتو مکرر شنیدمی

****

# حریق
# در تاریخ مشاهیر کرد
# تالیف: بابا مردوخ روحانی

## "شیَوا"

ملا صالح متخلص به "حریق" فرزند ملا نصرالله به سال ۱۲۷۱ هـ.ق در دهکده زیوه از نواحی سورداش تابع لوای سلیمانیه عراق تولد یافته است.

پدرش ملا نصرالله اهل روستای کاشتر از دهات بیلوار کردستان بوده است که پس از خاتمه تحصیل در مناطق کردنشین ایران و عراق در زیویه اقامت گزیده و همانجا تاهل کرده است.

حریق ابتدا نزد پدرش مقدماتی را فرا میگیرد و پس از آن مدتی در قره داغ و ایامی در پنجوین و بیاره و سلیمانیه درس خوانده، پس از آن راهی سابلاغ میشود و در آنجا تحصیلات خودرا به پایان میرساند، آنگاه به خدمت شیخ یوسف"شیخ شمس الدین برهان" مشرف میشود و بعد از تمسک به طریقه نقشبندیه و یک مدت سیر و سلوک، به سابلاغ برگشته تاهل میکند و در یکی از مدارس آنجا به تدریس میپردازد و عاقبت در اواخر سال ۱۳۲٦ یا ۱۳۲۷ هـ.ق در سن ٥٦ سالگی همانجا به دیار آخرت میپیوندد.

حریق از شعرای خوش ذوق و بلیغ.کردی سورانی است، اشعارش بیشتر تغزل و غرامی و مملو از صنایع و محسنات لفظی و معنوی است، به فارسی و عربی نیز شعر گفته و دیوانش به سال ۱۹۳۸ م در بغداد به چاپ رسیده است.

و اینک اشعاری از حریق.

## جام زر

خیــز ای زیبــا پــسر دســته بــه جــام زر زنــیم
بـــی تامـــل جـــام زر بـــر فتـــوی آزر زنـــیم
جـام بـر کـف، کـام در بـر، شـور در سـر یکرهـه
بیخـــود از عـــالم ره آن عـــالم دیگـــر زنـــیم
گــر حریقــان را بــه مــسجد ره نمایــد شــیخ شــهر
مــا کــه در میخانــه راهــش در ســر کــوثر زنــیم
او بـــه تهدیـــدات مـــبهم راه مـــا در میزنـــد
مــا بــه تمهیــدات محکــم راهــش از کــوثر زنــیم
قطــره ســان بــی پــا و ســر رو جــانبی دریــا نهــیم
غوطـــه ور گـــرداب انـــدرپای پهنـــاور زنـــیم
قطــره مــشتق آمــد از دریــا بــه وصــف قطرگــی
وصــف بــرداریم مــشتق را و در مــصدر زنــیم
در مقـــام لـــی مـــع الله در حـــریم کبریـــا
دســت رد بــر ســینه هــر کهتــر و مهتــر زنــیم
رخــت را جــایی فــرا داریــم کــه آنجــا جبرئیــل
گــر زنــد پــر آتــش یکبــاره بــر شــهپر زنــیم
پــای عــزت بــر فــراز عــرش و آنــسوتر نهــیم
ســربه ســنگ آســتان پــاک پیغمبــر زنـــیم

# تاریخ وفات استاد فاضل
# مرحوم "ملا وسیم" سردشتی

## "گنج مستور"

ای دریغا چشم علم از دوریت بی نور شد
نور علمت در بصیرت طالبان را دور شد
گنج را رسمست زیر خاک توی گل رود
ای دریغا گنج علمت در نظر مستور شد
گوهر دریای علمت جمله چون در یتیم
عقد جان بود از دست اجل منشور شد
خانه دین از فوات علم میگردد خراب
خانه جهل از وفات عالمان معمور شد
مرده دل زنده را گلها بسر گلها بود
خاک بر سر زنده دل، مرده گر مغرور شود
پرتو "شمس الیقین" نازم بهرجائی که تافت
ز آن تجلی موسیان را کوه دل چون طور شد
آری آری هر "وسیمی" را نسیم از قبله یافت
از صفای صدق نیت سعی او مشکور شد
از فیل خرق عادت جانش از مهر وطن
در صفر عزم سفر کرد و ز تن مهجور شد
مسئله کردم ز هاتف حال آن مرحوم را
زد بشارت بر ملا تاریخ او "مغفور" شد

۱۳۲۶ هجری قمری

# فەرهەنگی دیوانی حەریق

**ئـ ـ**

**ئادەم:** ئینسانی یەکەم، باوکی نەوەی مرۆڤە، بەپێی بیروڕای ئایین خـودا لـە سـەرشـێوەی خۆی دروستی کرد و لە بەهەشتی دانا، حەووای لە پەراسوی ئادەم دەرهێنا و کـردی بـە ژنی، بەڵام هەردووکیان فەرمانی خودایان بەجێ نەهێنا لەبەر ئەوە لە بەهەشت دەرکران "٢" ئینسـان، مرۆڤـ ، کەس، نەوەی ئادەم.

**ئایین:** دین، مـەزهەب، شێوە و ڕەوشت، دەستوور، یاوەر.

**ئاوی بەقا:** ئاوی حەیات، ئاوی ژیان، لە زاراوەی سۆفیایەتیدا سەرچاوەیەکە لە تاریکیدا کە هەرکەس لێی بخواتـەوە ژیـانی هەمیـشـەیی دەسـتـدەکەوێ و لـە زاراوەی سـالیکاندا سەرچاوەی ئەوین و خۆشەویستییەکە هەرکەس لێی بخواتەوە هەرگیز نامرێت و لە بـەین ناچێت.

**ئاوێنە:** ئەینوك، پارچە شووشەیەکە پشتەکەی بەجیوە سواغ دراوە، ڕەنگی هەموو شتێك دەداتەوە.

**ئاتەشکەدە:** ئاگردان، شوێنی ئاگرە لێگرساندن، ئەو شوێنەی پەیڕەوانی دینی زەردەشت ئاگریان تێدا دەکردەوە، جێگای بەجێگەیانـدنی ڕێوشـوێنی ئـاییینی دینـی زەردەشـت، ئاتەشگاه.

**ئایەت:** "١" نیشـان، بەڵگە، عەلامـەت "٢" هەریەکێك لە ڕستەکانی قورئـان، پیـاوی گەورە، شتی سەیر.

**ئال و بەیت:** مەبەس بنەماڵە و خانەدان و کەسوکار و نەوە و ئالی پێغەمبەرە، خاوخێزان و بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلام.

**ئاشـوب:** ئـاژاوە، پەشـێوی، شـۆڕش، فیتنـە، هـەراوهۆریا، کـاری بەگژیەکاچـوون و تێکبەربوونی خەڵك، حاڵەتی تێکچوونی ئاسایش.

**ئاشوفتە:** شێواو، پەرێشان، خەمگین، ژیانی سەخت و تاڵ.

**ئاستانە:** دەرماڵ، قاپی گەورە، ماڵان، خیوی خستە ئاستانەکە.

**ئاهوی تەیار:** ئاسکی تاتار، مامزی تەتار، مامزی وڵاتی تاتارستان.

**ئامـال:** ئامانج، ئاوات، هیوا، ئارەزوو.

**ئاتەش ئەفروز:** ئاگر هەڵگیرسێن.

**ئازوردە:** ئازاردراو، ئیش پێگەیشتوو، ڕەنج دیتو، ڕەنجاو، دڵتەنگ، تۆراو.

**ئەرواح:** کۆی ڕۆحە، (١) ڕەوان، گیـان (٢) فەرمـانی خودا، وەحی خودا، فریشتە.

**ئەسباب "اسباب"** کۆی "سەبەب= سبب"ە (١) هۆ، بەڵگە، عیللەت، وەسیلە، ڕێگە، ئامراز (٢) پێوەندی نزیکی و خزمـایەتی، (٣) زاراوەیەکی زانستی عەروزە.

**ئەسکەندەر:** لە واژەی ئورووپایی ئەلیکساندرەوە وەرگیراوە کوری فیلیپـۆسـی ئیمپراتـۆری مەقدونی بووە، بە لەشکرێکی چل هەزار کەسییەوە هێرشی بردە سەر دەوڵـەتی دارا لـە ٣٣١ی پێش زایین، لە شەڕی "گوگا میـل" لە نزیك "هـەولێر" سـەرکەوت و دەوڵـەتی ئێرانی ڕوخاند و ئاگری لە ئێستەخر بەردا، بەسەر هەموو ڕوژهەڵاتی کۆندا زاڵ بـوو تـا گەیشتە ڕووباری سەند لە هێندوستان، ئەرەستۆ مامۆسـتای بـووە، ئەسـکەندەی عالـەم گیروزولقەرنەنیشی پێ دەڵێن.

**ئەلەست "الست"**: ئایانیم؟ واتە ڕۆژی ئەزەل و زەمانی کە سەرەتای نییە، دەڵێن ئەو کە خوا ڕوی قسەی لە نەتەوەی ئادەمبوو فەرمی: "الست بربکم"؟ واتە مـن پـەروەردگاری ئێوەنیم؟.

**ئەجناس**: کۆی "جنس"ە (١) ئەو شتەیە کە لە چەند جۆرە شتێك پێکهاتبێ، وەکو جنسی گیاندار کە بریتییە لە ئادەمیزاد و هەموو خاوەن گیانێك. (٢) لە زارەوەی زانستی مەشتقدا جنس ئەوە یە کە لە "انواع" پێکهاتووە، وەنەوع لە ئەسناف= اصناف" پێکهاتووە، وەسنف لە "ئەفراد- افراد"، پێکهاتووە، (٢) کەلوپەل، کالاّ، ناومالّ، جنێو.

**ئەسرار "اسرار"**: کۆی "سره": نهێنی، شتی داپۆشراو و نەبیزاو، ڕاز.

**ئەفسانە**: حەکایەت، داستان، چیرۆکێکی ڕوەداوی کۆنی وا بگێڕێتەوە نەچێتە مێشکەوە و عەقلّ وەری نەگرێ، نەقل، سەرگوزەشتە.

**ئەفشان**: بلاّوکردنەوە، ڕژاندن، پەراکەندەکردن، ئاشکراکردن.

**ئەلەم**: "الم": ئازار، دەرد، ژان، ڕەنج، ئێش.

**ئەنجومەن**: دەستە، کۆڕ، دەزگایەکی هەمیشەییە کە لە چەند کەس پێکهاتبێ بۆ هەلّسوڕانی کاروبار و ناوبەناو کۆببیتەوە بۆ تەگبیرکردن، مالّی کۆمەلّ خانووی جەماعەت.

**ئەسناف "اصناف"**: کۆمەلّی کاسب و وردەسەنعەتکار، تاجر، بازرگان، دوکانداران.

**ئەحزان "احزان"**: کۆی :حزن"ە، خەم و خەفەت پەژارە و دلّتەنگی، دژی خۆشی.

**ئەشك**: فرمێسك، ئاوی چاو، ئەسرین.

**ئەهل "اهل"**: (١) شایان، خاوەن، پسپۆڕ، (٢) بنەمالّە، خێزان، خانەوادە.

**ئادابی تەریقەت**: ڕێ و ڕەوشتی سۆفیایەتی، ڕێ و شوێنی دەروێشی.

**ئايات "ايات"**: کۆی ئایەت= "ايات"ە، ئایەت: بەڵگە، نیشان.

**ئەجەل "اجل"**: ئاکام، وع عدەی مردن، ئەو دەمەی ژیانی کەسێك تێیدا تەواو دەبێ، وەختی شتێك.

**ئەمەل "امل"**: ئاوات، هیوا، ئامانج، ئارەزوو،

**ئەرشەد** "ارشد": ئازاتر، گەورەتر، باڵاتر، ئەو کەسەی کە لە ناو کاران و هاوڕێیانی خۆیدا پلەیێکی بەررزتری هەبێ. ئەو کەسەی بە ڕێی ڕاستدا دەڕوا، پێگەیشتووتر، بەتەمەنتر، گەورە و سەرکردەی دەستەیەك.

**ئەسەر**" اثر" :شوێن، نیشان، شوێنی پێ، گێڕانەوە، هەموو شتێکی کە وێنەی مابێتەوە، نیشانە و بەڵگەی بوونی شتێك لە وەختێکا لە شوێنێك پیشان بدات.

**ئەساس "اساس"**: بناغە، پایە، بنچینە.

**ئەعلا "اعلی"**: بەرز، باڵا، بڵند، "مەعنەوی" خودا دەرەجەی ئەعلاکا.

**ئەحکام "احکام"**: کۆی "حوکم= حکم"ە، فەرمان، هەموو فەرمانێکی کە لە دادگا دەردەکرێ بۆ کارەسات و ڕووداوێك.

**ئەشیا "اشیاء"**: کۆی "شیاء" شت، شتومەك، کەلوپەل.

**ئەشرەف "اشرف"**: گەورەتر، مەزنتر، بەڕێزتر، ئەشرەفی عالەم: بەڕێزتر و شەریفتر لە هەموو عالەم نیاز حەزرەتی موحەمەد پێغەمبەری خوایە.

**ئەفغان "افغان**: ئاهونالە گریان و شیوەن، بانگ و هاوار، فەریادوزاری.

**ئەرەستۆ "ارسطو"**: حەکیم و زانای نێوبەدەرەوە کە مامۆستای ئەسکەندەی مەقدۆنی بووە.

**ئەزهار "ازهار"**: کۆی "زهرە-زهر"ە گوڵ، شکۆفە، پشکوتنی خونچە و گوڵ.

**ئەجزا "اجزاء"**: کۆی "جوزئـ=جزء"ە، بەش، پارچە لە شتێك، بەشێك لە شتێك.

**ئەمیر "امیر"**: فەرمانڕەوا، فەرماندە، میر.

**ئەشعار "اشعار"**: کۆی "شێعر=شعر"ە، چامە، هۆنراوە.

**ئەزەل "ازل"**: هەمیشەیی، ئەوەی سەرەتا و دوایی نییە، هەر بووە و هەر دەبێ.

**ئەقوال "اقوال"**: کۆی "قەول= قول"ە، قسە، وتار.

**ئەکل "اکل"**: خواردن.

**ئەفسوردە "افسردە"**: ژاکاو، خەمگین، دڵتەنگ، دڵسارده.

**ئەمن "امن"**: بێباکی، دڵنیایی، بێ ترسی، هێمنایەتی دڵ، ئاسایش، دژی خۆف.

**ئەخلاف "اخلاف"**: کۆی "خەلەف=خلف"ە، جێنشینان، لەپاش بەجێماوان، داهاتووان.

**ئەنیس "انیس"**: هاودەم، ئەوەی دڵ دەداتەوە، ئەوەی دەبێتە مایەی خۆشی بۆ یەکێکی تەنیا و گۆشەگیر.

**ئەولیا "اولیاء"**: کۆی وەلی، "اولیاء الله": دۆستانی خودا، بەندەکانی نزیکی دەرگای خودا، لە زاراوەی خواناسان و عارفاندا ئەولیا لە دوی ئەنبیا و پێغەمبەرانن کە کەرامەتیان هەیە و دەتوانن نهێنییەکان ئاشکرا بکەن، پیاو چاك، شێخی دین.

**ئەوساف "اوصاف"**: کۆی "وصف=وەسف"ە چۆنایەتی شتێك، ئەو نیشانانەی شتێك یا کەسێکیان پێ دەناسرێتەوە، پەسند، وەسپ.

**ئێکسیر**: (١) زاراوەیەکی زانستی کیمیایە، بە تایبەتی لەلایەن کیمیاگەرانی کۆن بەکاردەهێنرا، ئەو جەوهەرەیە کە بنیاد و نەژادی شت دەگۆڕێ، بۆ بەڵگە مس بکا بە زێڕ و ئاڵتون، دەرمانی کە بە بیروباوەڕی پێشینان چارەی هەموو نەخۆشییەکی کردووە،

بیروباوەڕی مورشیدی تەواو کە چۆنایەتی خەڵك بگۆڕێ، (٢)شتی یەکجار بەکەڵك و بەسوود، (٣) هەر شتێکی کەم دەستکەوێ.

**ئیسلام "اسلام"**: ئایینی موسوڵمانان لە دەوروبەری ساڵی ٦١١ زایینی بەهۆی حەزرەتی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا بڵاوبووەوە، لە پێشانا لەناو عەرەب، ئینجا لەناو هەندێ نەتەوەی دیکەیش.

**ئیشعار "اشعار"**: ئاگادارکردن، خەبەردان بە کەسێك، زاناکردنی کەسێك بە کارێك، فێرکردن، پێ ڕاگەیاندن.

**ئیمکان "امکان"**: (١)ڕێ تێچوون، توانایی بەرامبەر بە کارێك، ڕێگەخۆشکردن، (٢) لە زاراوەی زانستی فەلسەفەدا ئەو شتە یەکبوون و نەبوونی وەکو یەکە و پێویست نییە، وەکو ئینسان، جانەوەر، کشتوکاڵ، بێ گیان، بەرامبەر ئەوە "وجوب" هەیە کە بوونی پێویستە وەکو "واجب الوجود" ئەمە کۆمەڵێ ئینسان و جانەوەر و کشتوکاڵ و بێ گیانە.

**ئیرەم**: (١) ناوی باخێکە گۆیا شەدداد دروستی کرد بە ناوی ئەوەی ببێتە بەهەشتی سەر زەوی، لەبەر ئەوە بەهەشتی شەدادیشی پێ دەڵێن (٢) ناوی عەشیرەتێکە لە هۆزی "عاد" خودا غەزەبی لێگرتن لەبەر گوناهی زۆریان، ئەدودا وانە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە.

**ئیشراق "اشراق"**: (١) ڕووناك بون، پرتەوە، درەوشانەوە تروسکە و ڕووناکی خۆر، ڕۆژهەڵاتن. (٢) ئیلهام وەرگرتن.

**ئینسان "انسان"**: ئادەمیزاد، خەڵك، بەشەر، بیلبیلەی چاو.

**ئولفەت "الفت"**: (١) خووڕەوشتگرتن، دۆستایەتی، فێربوون، هاودەمی، ڕاهاتن، هۆگری، پەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ کەسێك یا شتێك، حەز لە شتێك یا کارێك کردن.

**ئیبداع "ابداع"**: پەیداکردن، بەدیهێنانی شتێکی جوان و تازە، کردنی کارێکی تازە، لە زاراوەی زانستی بەدیدا ئەوەیە کە شاعیر شیعرێك بڵێ. کە چەند سەنعەتەکانی بەدیعییەی تێدا بێ.

**ئیزهار "اظهار"**: دەرخستن، ئاشکراکردن، ڕوونکردنەوە و دەربڕینی قسەیەك.

**ئیشارات "اشارات"**: کۆی ئیشارەیە، (١) پیشاندانی شتێك بە هۆی بزوتنەوەی چاو یا قامك، بە دەست و چاو یا برۆ قسەکردن لەگەڵ کەسێك، قسەکردن بە ڕەمز، قسەکردن بەکینایەت، (٢) لە زاراوەی بەدیع دا ئیشارە ئەوەیە کە شاعیر بە واژە وێنە زۆر دروست بکا.

**ئینشا "انشاء"**: دروستکردن، داهێنان، نووسینەوەی قسەی جوان، وتنی قسەی جوان، لە خووەشت داهێنان کە نامەی ئەدیبانە، ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی قسە بە نووسین.

**ئیرتیهاش "ارتهاش"**: دەستبڕین، فروفێڵ.

**ئیرس "ارث"**: میرات وەرگرتن، بەشداربوون لە میرات، سەروەت و سامان و هەر شتێکی کە لە کەسێکی مردوو بۆ بنەماڵە و خانەوادە و خێزانی بەجێ دەمێنێ.

**ئیمتحان "امتحان"**: تاقیکردنەوە، تاقیکاری، ئەزموون.

**ئیسناد "اسناد"**: گەڕانەوەی شتێك بۆ سەرشتێکی دیکە، گەڕانەوەی قسە بۆ ئەو کەسەی کە کردبێتی، گەڕانەوەی حەدیس بۆ پێغەمبەر.

**ئیتتیفاق "اتفاق"**: ڕێکەوت، ڕووداو، کارەسات، حادیسە.

**ئیکمال "اکمال"**: تەواوکردن، گەیاندن بە ئاوات و ئامانج.

**ئیفتیا "افتراء"** بە درۆ تاوان بۆ کەسێك دروست بکرێ، تاوان هەڵبەستن.

**ئیلاهی**: خودایا، ئەی خودا، خودایی، زانستی هەراوی خواناسی.

**ئیقبال "اقبال"**: (١) پێشوازیکردن، روودان، (٢) بەخت، چارەنووس، تالیع.

**ئەمر "امر"**: فرمان، بڕیار، شتی بەرز، روداوی گەورە.

**ئیفادە**: دەعیە، فیز، تەکەببور، (٢) هەموو ئەو وەڵامانەی کەسێك دەربارەی مەسەلەیەك لە پرسیار و وەڵامێکی رەسمیدا دەیانداتەوە.

**ئینکار "انکار"**: حاشاکردن، کەسێکی قسەی کەسی بە گوێیدا نەچێ، لەسەر قسەی خۆی سووربێ، ئینکارکردن: پاشگەزبوونەوە لە قسەیەك یا لە کارێك.

**ئیرادەت "ارادت"**: دڵسۆزی و ئیخلاس لە دۆستایەتیدا، دۆستایەتیدا ڕاست تێکەڵ بە خۆبەکەمگرتن و بچووکایەتی.

**ئیسرار "اصرار"**: لەسەر ڕۆیشتن، پێ داگرتن، سووربوون، لەسەر کارێك یا شتێك.

**ئیستیمداد "استمداد"**: یارمەتی ویستن، کۆمەك خواستن.

**ئیرشاد "ارشاد"**: ڕێ نیشاندان، ڕێنوێنیکردن بۆ ڕێی ڕاست، ڕێبەریکردن، ڕێنمایی.

**ئیسم "اسم"**: ناو.

**ئیستادەن**: ڕاوەستان.

**ئیخلاس "اخلاص"**: دڵپاکی و دڵسۆزی لە دۆستایەتیدا، ڕاستی و جگەرسۆزی لە کاروکردەوەدا.

**ئیزاعە "اضاعە"**: زایع کردن، بەفیرۆدان، بە هەدەردان، لە دەستدانی شتێك لە خۆڕایی، (٢) زۆربوونی ئاو و زەمینی کەسێك.

**ئیمزا "امضاء"**: نیشانەیەکە لە دوای نامە و نووسراوەوە دادەنرێ، نووسینی ناوی نووسەری نامەیە بە شێوەیەکی تایبەتی لە پای کاغەز و نووسراوەدا بە ئەوەی بزانن کێ نووسیویەتی .

**ئەبلە "أبلة"**: بێ عەقڵ، تێ نەگەیشتوو، نەزان، گێژ، عەقڵ سووك، دەبەنگ، نەفام، حۆل.

**ئیلتیفات:** چاو لە کەسێك کردن لە ڕووی خۆشەویستی و میهرەبانیەوە، ڕوانین لە کەسێك لە چاوی خۆشەویستییەوە، چاکە و میهرەبانی کردن لەگەڵ کەسێك، بە نەرمی جوڵانەوە لەگەڵ کەسێك.

**ئیلتیماس "التماس"**: داواکردنی شتێك لە کەسێك. شت ویستن لە کەسێك خۆبەکەمگرتن، پاڕانەوە.

**ئینقیاد "انقیاد"**: وە ئەستۆگرتن، ڕام بوون، فەرمان وەرگرتن، خۆبەکەمگرتن.

**ئیعلان "اعلان"**: ڕاگەیاندن، ئاشکراکردن، دەرخستن، نووسراوە یا لاپەڕەیەکی چاپکراو کە بەهۆی ئەوەوە. مەبەستێك بە خەڵك ڕابگەیەندرێ بۆ ئاگاداری.

**ئەهلی نیسبەت:** ئەو کەسەی پەیوەندی و نزیکایەتی لە گەڵ خواناسان و پیاوچاکاندا هەیە.

**ئەهلی کیبار:** پیاوانی گەورە، ئەو کەسانەی مەزن و بەڕێزن.

**ئەرباب "ارباب"**: کۆی "رب-ڕەب"ە: خاوەن، بارهێنەر، جوامێر، خان، خاوەن پارە و دەوڵەمەند.

**ئەتیببا "اطباء"**: کۆی "طبیب-تەبیب"ە: حەکیم، پزیشك، دوکتۆر.

**ئیقلیم "اقلیم"**: هەرێم، مەڵبەند، ناوچە، پارچەیەك لە زەوی کە لە باری ئاو و هەوا و وەزعی سروشتی لەگەڵ پارچەکانی دیکەدا جیاوازی هەبێ و هەڵبژاردە و چاتری ئەوانی دیکە بێ.

**ئیتتیفاق "اتفاق"**: بەیەکەوەبوون، چەند کەسێك کە بیروڕا و قسەیان دەکەن بەیەك. هاوڕێی، هاوکاری، یەکیەتی، هاوپەیمان، (٢) ڕووداو ، کارەسات، پێشهات.

**ئەدنا "ادنی"**: نزمتر، زەبوونتر، پەستتر، نزیکتر.

**ئیمساك "امساك"**: دەستپێوەگرتن، خۆدوورخستنەوە لە خواردەمەنی (٢) بەخێل، چاوچنۆك، رژد.

**ئیفتیراش "افتراش"**: دەستکردن بە سەرین، هەردوو باسك کردن بە سەرین.

**ئیغتیشاش "اغتشاش"**: پەیدابوون و دەرکەوتنی غەل و غەش و ئالۆدەیی کە لە کەسێکدا یا لە شتێکدا، شێواوی، سورش.

**ئومەنا "امنا"**: کۆی "امین= ئەمین"ە دروستکار، ڕاست و دروست، دەستپاك، ئەو کەسەی کە خەڵك باوەڕی پێ بکات، حاڵی ئەو شوێنەی پیاو ترسی ئەوەی نەبێ لەوێ شتێکی بەسەر بێ یا تووشی بەڵایەك ببێ.

**ئیدبار "ادبار"**: ڕوو وەرگێران، پشتکردنەوە، وەرگەڕانی بەخت، بەدبەختی، چارەڕەشی.

**ئوسول "اصول"**: کۆی "اصل= ئەسل"ە، بناغە بنیاد بنج، قانوون، دەستوور، سەرەتاکان، مەبادی سیاسی، داب و دەستووری کۆمەڵایەتی.

**ب ـ**

**باقی**: (١) نەمر، هەرمان، بەردەوام، پایەدار، ئەوەی ماوە، ئەوەی لە جێگەی بیکی تر دەمێنێتەوە، (٢) ماوەی شتێك کە لە شتێکی تر دەردەهێنرێ.

**بارەگاە**: کۆشك، کاخ، قەسری پادشایان، ئەو شوێنەی کە فەرمانڕەوایان ئیجازەی خەڵك دەدەن بۆ ئەوەی پخش بولایان.

**باب**: (١) باوك، (٢) دەرگا، دەرکە، دەروازە، بە شێك لە کتێب.

**باغی**: لە خوانەترس، زۆردار، سەرکێش، گەردن کەش.

**بایەزید "بایزید"**: بایەزیدی بەستامی عارف و خواناسی گەورەی سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچییە کە عارفان و زانایان و شاعیرانی ئێرانی و ئیسلامی، "برهان المحققین" "حجة الخلایق" "مرشد السالکین"یان ناو ناوە و لە ئەستێرە هەرە پرشنگدارەکانی عیرفانە، ناوی ئەبو یەزید تەیعوری کوری عیسای کوری سروشانی بەستامییە، لە بنەماڵەیەکی زەرتەزشتی بوو کە لە پاشان موسوڵمان بوو، شاری بەسنام لە تەنیشت شارەکانی سەمنان و دامەغای ئێستای ئێرانە.

**بەشارەت "بشارت"**: مزگێنی، موژدە، خەبەری شادی، هەواڵی خۆش.

**بەقا "بقاء"**: مانەوە، هەمیشەیی، تێکەنەچوون، نەمردن، هەرمان.

بەنی ئادەم: ئادەمیزاد، نەوەی ئادەم، خەڵك ئینسان مرۆڤ.

**بەیەت "بیت"**: (١) ماڵ، خانوو، خان، جێگەی ژیان و حەسانەوە، (٢) ماڵی خودا، کابە، کەعبە، (٣) دێری شیعر کە لە دوو نیوە دێڕ شیعر یا میسراع پێکهاتووە، چیرۆك، داستان، بەیت و باو و کەلەپوری ئەدەبی.

**بەسیرەت "بصیرت"**: بینایی، زانایی، ڕووناك بینی، زیرەکی، وشیاری، یەقین، ڕەوشەن دڵی، عەقڵ، (٢) بریتییە لە هێزی قەلبی کە بە نووری پیرۆز و ڕووناك بێ بەم هێزە ئینسان حەقیقەت و پاتینی شتەکان بینێ، هەر بەو جۆرەی کە نەفس بە هۆی چاو وێنە و شێوە و ڕواڵەتی شتەکان دەبینێ، زانایان و پێشینیان "بەسیرەت" بە هێزی پیرۆز، واتە "قووەی قودسییە" ناو دەبەن.

**بەرجەستە**: وەسەرکەوتو ، کەسێکی بەناوبانگ و گەورە، چاك، هەڵبژێردار، بەرز، چوست و چالاك.

**بەیتولحەزەن "بیت الحزن"**: (١) ژووری خەم و خەفەت، ماڵ و مەڵبەندی خەوناسۆر، هەموو جێگەیێکی خەو خەفەتی لێ بێ، (٢) ئەو ژوورەیە کە یەعقوب تێیدا دەژیا و لە

دووری یوسفی کوڕی دەتلایەوە و لە شین و ناسۆر و واوەیلادا بوو، "بیت الاحزان" و کولبەیی ئەخرانیشی پێ دەڵێن.

**بەیدەق:** ڕێگا نیشاندەری سەفەر، ڕابەری سەفەر، (٢) ناوی یەکێك لە بەردەکانی شەترەنج، (٣) سەبازی پیادە.

**بینا:** بینەر، زیرەك، ئاگادار، بەهۆش.

**بەزم:** جەژن و ئاهەنگ، کۆبوونەوەی خۆش ڕابواردن، کۆڕی خواردنەوە و سەرخۆشی.

**بەکارەت** "بکارت": ژنی نەسمراو، ژنی کوننەکراو، کچێنی، (٢) نۆبەرە، سەرەتا و یەکەمی هەموو شتێك، تازەبوون، دڕینی پەردەی کچێنی.

**بەهاییم** "بهائم": کۆی "بهیمە- بەهیمە"یە: حەیوان چوارپێیان، پاتاڵ، ئاژەڵ.

**بەعید** "بعید": دوور

**بیمار:** نەخۆش، ناساغ، کەسێکی تەندروستی بکەوێتە مەترسییەوە.

**بورج:** (١) هەر یەکێك لە دوازدە بەشی فەلەك کە زەوی لە دەوریان دەسوڕێتەوە، هەر کاتێك کە زەوی یەکێکیان دەبڕێ مانگێکی خورشیدی تەواوە دەبێ، بەم پێیە بورجەکان دوازدەن بەرامبەر دوازدە مانگ، بەرخ، گا، دوپەیکە، قرژاڵ، شێر، گوڵەگەنم، تەرازوو، دوپشك، کەوان، کار، دەولك، نەهەنگ، (٢) کۆشك، قەلا، بینای بلندی خڕ، یا چوارگۆشەی کە بۆ پاسەوانی بەکاردەهێنرێ، هێلانەکۆتر.

**بوسە:** ماچ.

**بوهتان:** درۆ، بوختان، بەدرۆ هەڵبەستنی قسە بە زمانی یەکێکی دیکەوە.

**بوریا:** حەسیر، هەموو ڕایەخێکی لە قامیش و لقی دار خورما دروست کرابێ.

**بورهان:** ڕونکردن، بەڵگە، دەلیل، حوججەت (٢) ناوی گوندێکی سەر بە ناوچەی مهابادە.

**بوعد "بعد":** دووری، دووربونەوە، دوورکەوتنەوە.

**پ -**

**پابوس:** پێ ماچ کەر.

**پەرچەم:** کاکۆل، قژی سەر نێوچاوان (٢) دروشم، ئەو قوماشەیە کە بە دارەوە دەکرێ و دروشم و نیشانەی ولاتێك یا ڕێکخراوێکە، (٣) ئەو جێیەیە لە گوڵدا کەتۆوی لێیە.

**پرتەو:** تیشك، تریفە، تروسکە، پرشنگ، ڕووناکایی، شۆق.

**پیر:** بەساڵاچوو، بەتەمەن گەورە، کۆنەساڵ، شێخ، شێخی خانەقا، پیری مەیفرۆش، پیری تەریقەت، مورشید و ڕابەری دەروێشی.

**پیری خەرابات:** پیری مەیخانە، پیری مەیفرۆش، لە زاراوەی سۆفیزمدائینسانی یۆخت و شارەزا، ڕێبەر و مورشیدی "کامیل" کە مریدان بوریی هەژاری و سۆفیایەتی ڕێنوێنی دەکا.

**پیری مەیکەدە:** پیری مەیخانە، لە زاراوەی سۆفیایەتیدا ئینسانی وخت و کامیل، ڕێبەری ڕۆحانی، ڕێنما و مورشید، پیری تەریقەت، بەساڵاچووی بادەفرۆش.

**پیری کەنعانی:** نیاز، یاقوب پێغەمبەرە.

**پیری موغان:** سەرۆك و گەورەی موغەکان کە پێشەوایانی ئایینی زەردەشتی بوون.

**پیراهەنی یوسف:** کراسی یوسف کوڕی یەعقوبە، دەڵێن ڕۆژێك هەر دوازدە کوڕی یەعقوی دەچن بۆ سەیران یوسف خۆشەویسترینیان دەبێ لای باوکی، براکانی یوسف دەخەنە بیرێکەوە، لە ئەنجامی ئەو ڕووداوە یەعقوب لە خەفەتا کوێر دەبێ، لە پاشا کە

کراسەکەی یوسفی بۆ دێنن یەعقوب بۆنی پێوە دەکا و چاوی چا دەبێتەوە و بینایی و ڕووناکایی پێشووی دەست دەکەوێتەوە.

**پوختە:** خواردەمەنی پێگەیوو، دژی خاو، ئینسانی کارامە و زانا و خاوەن تاقیکردنەوە.

**پوپ چەرمك:** ڕیش سپی.

**پەیمانە:** جام، پیالە، ئەو قاپەیە کە شەراب و مەی تێدا دەخورێتەوە، کاسەیەکە کە دانەوێلە و شتی دیکەی پێ دەپێون.

**پەیکان:** تیر، سەرەتیر، هەموو ئاستێکی نووك تیژ.

**پەیوەستە:** پێوەند، بە یەکتری بەستن، بەیەك گەیشتن، هەمیشە.

**پدەر:** باوك، باب.

**پسەر:** کوڕ، ئەولادی نێرینە.

**ت ـ**

**تالیع:** (١) بەخت، چارەنووس، (٢) دەرکەوتن، دیاربوون هەلاتنی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە، دیاربوونی دلبەر و خۆشەویست.

**تالیب "طالب":** (١) داخواز، ئەو کەسەی داوای شتێك دەکا تالیبان: ئەو کەسانی داوای شتێك دەکەن، قوتابیان داخوازان.

**تاوس:** باڵندەیەکی جوانە، نێرینەی تووك و پەڕی ڕەنگاوڕەنگی هەیە، تووکی لە سەرەتای هاویندا فڕێ دەدا و دووبارە هی تازە دەڕوێتەوە، بە زۆری لە خوارووی ئاسیا و هیندوستاندا دەژی، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەوڵەمەندانی ئەورووپا گۆشتی تاوسیان بۆ ڕێزگرتن لەپێش میوان دادەنا، لەگەڵ ئەوەی وەنەبێ گۆشتیشی خۆش بێ، لای هەندێ کەس ڕەمزی نالەباریە، دەڵێن تاوس بووە هۆی دەربەدەری ئادەم و حەووا لە بەهەشت،

ڕۆیشتنی بەناز و خان و خەرمانی کچی جوان لەناو کوردەواریدا لەگەڵ ڕەوی تاوس بەراورد و بەرامبەر دەکرێ.

**تابور "طابور":** لەشکر، تیپ، ریز، فیرقە.

**تازی:** تاژی، تانجی، تاجی، جۆرە سەگێکی ڕاووشکارە.

**تەبیعەت:** سروشت، خوورەوشت (۲) ڕووی زەوی، جیهان، دونیا، هەموو گۆڕان و دروستکردنێکی کە دەستی ئادەمیزادی تێدا نەبێ.

**تاریخ:** مێژوو، دیاریکردنی کاتە هەر شتێك، دیاریکردنی ئەو سەردەمەی کە ڕووداوی گەورەی تێدا بووە، لێکدانەوەی ڕووداو بەسەرهاتی پێشینیان.

**تاقی کسیا:** ئەیوانی کسیا، مەداین، بەناوبانگترین کۆشك وباڵەخانەیەکە شاهەنشاهانی ساسانی دروستیانکردووە، لە پێشانا ئاوەدان و یەکێك بوو لە خۆشترینی قەسر و باڵاخانەکانی جیهان، ئێستاکە کەلاوەیە، هەندێ لە تاق و دیوارەکانی ماوە، بە پێی ئەفسانەی ئایینی ناو کوردەواری گۆیا تاقەکە لە حەژمەت پەیدابوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام درزی بردووە، چونکە ڕەمزی سەردەمی گاوری و بوت پەرستی بووە.

**تابان:** درەوشەدەر، ئەوەی ڕووناکی دەدا.

**تابش:** (۱) درەوشانەوەی، پڕ ئەودان، ڕۆشنایی و گەرمایی ڕۆژ هەتاو و ئاگر (۱) سوورکردنەوەی ئاسن بە ئاگر.

**تاری زوڵف:** ڕەشی موو، تاڵ، تاڵی موو، داوی موو.

**تاعەت "طاعت":** پەیڕەوی کردن، ئیاعە کردن.

**تاماو:** تاوێك کە خۆی و ئاردی دەکەن و دەیدەن بە ئاژەڵ و پاتاڵ.

**تەبع "طبع":** خوورەوشت، سروشت.

**تەجەللا** "تجلی": ڕوون بوون، ڕووناك بوون، دیاربوون، تیشك، کینایەتە بۆ چوونی ڕۆحی خودا بۆ ناو دڵی سۆفی و دەروێش، ئەوەی دەگاتە پایە "فناء في الله": هەروەها کینایەتیشە بۆ دیاربوونی نوری خودا لە کێوی تور، ئەوەی موسای بێ هۆش و مەدهۆش کرد.

**تەجرید** "تجرید": (١) ڕووتکردنەوە، جیاکردنەوەی شتێك لە هەموو شتێکی کەلە بنجدا نەژادی ئەو نەبێ، پێستە لە دارکردنەوە (٢) شیروخەنجەر لە کالان دەرهێنان (٣) تەنیایی، گۆشەگیری.

**تەسبیح** "تسبیح": ئەو کەسەی دەڵێ "سبحان الله"، بە پاکی یادکردنەوەی خودا (٢) ئەو ڕستە وردە شتەیە کە لە موروودەکا و لە کاتی تەسبیحات دا لە دەست دەگیرێ.

**تەسویر** "تصویر": دروستکردنی وێنەی کەسێك یا شتێك گرتنی وێنەی کەسێك یا شتێك، نەخشکردنی شێوەی کەسێك یا شتێك وێنەگرتن.

**تەشریح** "تشریح": پارچەپارچەکردن، بڕینی ئەندامی لەش، (٢) ڕوونکردنەوە.

**تەریق** "طریق": (١) ڕێگە، ڕێ، شەقام (٢) شەرمەزاربوون.

**تەشریف** "تشریف": گەورە خۆپیشاندان، خۆدەرخستن، وەکو پایە بەرز و ماقول.

**تەرەب** "طرب": هەڵپەڕین و سەما لە ئەنجامی شادیدا، شادبوون، خۆشی ئاهەنگ و ڕابواردن.

**تەرەف** "طرف": کەنار، دوایی شت، لاجێگە.

**تەرح** "طرح": دانان، نەخشە کێشان.

**تەریدە:** جەردە، دز، ڕێگر، جەتە.

**تەخفیف** "تخفیف": سوککردن، کورتکردنەوە.

**تەعنە "طعنة"**: شوێنی نیزە لـە لەشـدا، قـسە سـوك بـە یـەكێك وتـن، دەرخـستنی كەموكورتی كەسێك، سەرزەنشتكردن.

**تەعمیر "تعمیر"**: ئاواكردن، ئاوەدان كردن، چاككردنەوەی خانوی روخاو، چـاككردنەوەی هەمو شتێكی كۆن كە كەم و كوری هەبێ، تێپەڕكردنی ژیانی زۆر.

**تەعداد**: ژمارەكردن، حیسابكردن، ئەژماردن.

**تەحسیل "تحصیل"**: وەدەستخستن، وەدەستهێنان، پەیداكردن، وەرگرتنی زانستێ.

**تەحەمول "تحمل"**: خۆڕاگرتن، لەبەر هـەموو ناخۆشـییەك، ئـارامگرتن، هێـز و توانـا نواندن.

**تەفسیر "تفسیر"**: (١) ڕوونكردنەوەی مانا و مەبەستی قسەیەك، ئاشكراكردنی مانـا و مەبەستی ڕستەیەك. (٢) ڕوونكردنەوەی مانای ئایەتی قورئان.

**تەزەرو "تذرو"**: چور، ناوی باڵندەیەكە گۆشتی دەخورێ، نێرینەی پەڕوباڵی جوانی هەیە، لەناو جەنگەڵ و كێڵگەكاندا دەژی.

**تەلیسم "طلسم"**: پارچە كاغەز یـان مەعدەنێكـە جادوگـەر و فاڵـچی یـان جـەدوەلی لەسەر دەكێشن و نووسینی لەسەر دەنووسن، باوەڕیان لەسەر ئەوەیە كە ئەمە پارێزگاری لە خەڵكی دەكا و ئازار و خراپەیان لێ دووردەخاتەوە.

**تەلەف "تلف"**: لەناوچوون، لەناوبردن، نەمان، فەوتان.

**تەلیعە "طلیعة"**: پێشەنگ، پێشڕەو، سەرەتای لەشكر، دیاریدان، دەركەوتن.

**تەعاروف "تعارف"**: یەكترناسـین، بـەخێرهێنانی یـەكێك پێـشكەشكردنی شـتێك بـە كەسێك.

**تەسەروف** "تصرف": بەدەسگرتن، داگیرکردن، دەستبردن بۆ کارێك یا شـتێك، گـۆڕینی کارێك بە مایل و ئارەزوو، ئەو کەسەی دەبێ بە خاوەنی شتێك.

**تەحقیق** "تحقیق": پێ ڕاگەیشتن، لێکۆڵینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی کارێك یا شتێك، ڕاستی و دروستی.

**تەقسیم** "تقسیم": بلاوکردن، بەشکردن، دابەشینەوە.

**تەقدیم** "تقدیم": وەپێشخستن، پێشکەشکردن.

**تەزویر** "تزویر": فریو، دووڕوویی، ڕیاکاری، فێڵ، دەغەلی، فێڵکردن لە کڕین و فرۆشتندا.

**تەتیمە** "تتمە": دوایی، پایان، دوایی شت، ئاخری.

**تەغنیە** "تغنیة": گۆرانیی وتن، ئاواز دەرخستن.

**تەئسیر** "تاثیر": کارتێکردن، کارلێکردن، دەسەڵات بەسەردا سەپاندن.

**تەهارەت** "طهارت": پاکی، پاکوخاوێنی.

**تەمەع** "طمع": ئارەزوو، ویستنی زۆر.

**تەزکیر** "تذکیر": یادکردن، وەبیرهێنانەوە، ئامۆژگاریکردن.

**توشە**: تویشو، ئەو خواردەمەنیەی کاتی سەفەر ڕێبواران لەگەڵ خۆیان هەڵی دەگرن، خواردەمەنی بۆ کاتی پێویستی.

**تەکالیف** "تکالیف": کاری قورس و گران، کارێك لە توانانی ئادەمیزاددا نەبێ، ئەرکی سەخت و گران.

**تەواف** "طواف": گەڕان بە دەوری شتێکدا، گەڕانی شت، سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا.

**تەمکین** "تمکین": هێز و تواناداان، ڕێگە خۆشکردن.

**تەن:** (١) لەش، بەدەن، جەستە (٢) ڕەشی مەنجەڵ.

**تەوف** "طوف": سوڕان لە دەوری شتدا، بڕوانە تەواف.

**توفەیلی** "طفیلی": نیسبەتە بە کەسێك ناوی توفەیل بووە، کە بەبێ بانگکردن بە میوانی چۆتە سەر سفرەی خەڵکی، میوانی بانگنەکراو.

**تفل** "طفل": منداڵ، بچووکی ئادەمیزا، منداڵی ساوا.

**توخم:** تۆو، دان، دانە، شەهوەت.

**توحفە** "تحفە": دیاری، ئەرمەغان، سەوقات، هەموو شوێنێکی بچووك و بەنرخ، هەموو شتێکی بەنرخ.

**تەتهیر** "تطهیر": پاکی.

**تەبلە** "طبلە": سندوقێکی بچووك یا کاسەیەك کە لە دار یا لە شووشە دروست کرابێ و عەترفرۆش لەودا عەتری بۆن خۆش ڕابگرێ.

## ج -

**جان:** (١) گیان، ڕەوان، ڕۆح (٢) جنۆکە، جن، ئەجندە.

**جانی جانان:** گیانی گیانان.

**جاسوس:** ئەو کەسەی دەنگ و باس و هەواڵ دەگەیەنێ، ئەو کەسەی هەواڵی نهێنی کەسێك یا وڵاتێك کۆدەکاتەوە و دەیدا بەلایێکی دیکە.

**جەلال** "جلال": گەورەیی، بڵندی، بەرزی، شکۆ.

**جەننەت** "جنت": باخ، بەهەشت، فیردەوس.

**جەبر** "جبر": (١) بەستنی ئیسقانی شکاو، ئەندامێکی کە ئێسقانی شکابێ و لە گەج گیرابێ، (٢) ناوی کۆمەڵێکی فەلسەفییە، جەبرییان پێ گتووە بیروڕایان ئەوە بووە کە

تەواوی کردەوەی ئادەمیزاد بە فەرمانی خودایە بەندە هیچ جۆرە ئیختیارێکی نییــە، دژی "اختیار تفویض"ە (٣) جەبر و موقابە لە زانستێکی ماتیماتیکییە کە تێیدا تیــپ لــە باقی ژمارە بەکاردەهێنرێ.

**جەهل** "جهل": بەهۆشی، نەزانین، نەخوێندەواری، دژی زانستی.

**جلیوە**: ئاشکراکردن دیاریدان، خۆنیشاندان بە کەسێك (٢) لــە زاراوەی ســۆفیایەتی و عیرفاندا بریتییە لە درەوشانەوەی نوری خوایی لەناودڵی عارف و خواناسدا بە جۆرێ کــە سەوداسەر و شەیدای بکا. (٣) ئەو دیارییە کە زاوا لە کاتی بەیەکگەیشتندا پێشکەش بووکی دەکا.

**جینس** "جنس": ئەو شتەیە کە لە چەند جۆرە شتێك پێکهاتبێ، وەکو جنسی گیانــدار کە بریتییە لە ئادەمیزاد و هەموو خاوەن گیانێــك. (٢) لــە زاراوەی زانــستی مەنتیقــدا جینس ئەوەیە کە لە ئەنواع پێکهاتووە، (٣) کەلوپەل، کاڵا.

**جەمع** "جمع": هەموو شتێکی بڵاو و پەراکەندە کۆبکرێتەوە، زاراوەیەکی زانستی دیعە، ئەوەیە کە شاعیر دوو سیفەت یا زیاتر لە یەك حاڵەتــدا کــۆ بکاتــەوە، (٢) کۆمــەڵێك، تاقمێك، کۆمەڵێك ئادەمیزاد.

**جەمعییەت** "جمعیت": (١) کۆبوونەوە، یەکگرتن، تەبایی لەناو یەکدا، (٢) کۆمەڵــە کەسێك، خەڵکێکی زۆر لە شوێنێکدا کۆببنەوە.

**جەللاد** "جلاد": ئەو کەسەی کە کوشتنی مەحکومانی پــێ دەســپێرن، ئــەوەی ئــازار و ئەشکەنجەکردنی خەڵکی پێ ئەسپێراوە، میر غەزەب.

**جەلا** "جلا": (١) ڕوون و دیار، ئاشکرابوونی هەرشتێکی، (٢) مشتومالکردنی ئاوێنە و شیر و خەنجەر و شتی دیکە لە ژەنــگ و ژار و گەڕاندنــەوەی بریقــە و تروســکەی، (٣) دوورکەوتنەوە لە ماڵ و مەڵبەند و نیشتمان.

**جینایەت** "جنایت": تاوان، سوچ، گوناهی گەورە.

**جەستە:** لەش، بەدەن.

**جیفە:** کەلاك، لاتە، مردار، لەشی مردووکە خراپ دەبێ و بۆگەن دەکا.

**جەنوب** "جنوب": قیبلە، نیوەڕۆ، یەکێکە لە چوار لاکان بەرامبەر باکورە، لای ڕاستی کەسێکە ڕووبەڕووی ڕۆژهەلات، بوەستێ.

**جیهان** ئارا: جیهان ڕازێنەرەوە.

**جیهانگیر:** ئەو کەسەی کە ناوبانگی دەچێ بۆ هەموو شوێنێکی ئەم جیهانە، پاشایەك کە ولاتانی گەورە دەگرێ.

**جەد** "جد": باوکی باوك، باوکی گەورە، باوکی دایك.

**جیسم** "جسم": لەش، بەدەن، جەستە، پەیکە، هەر شتێکی.

**جەری** "جریٔ": ئازا، بێباك، نەترس.

**جەیش:** لەشکر، دەستە، سپا.

**جورم** "جرم": گۆناە، تاوان، خەتا.

**جەولان:** دەورلێدان، هێنان و بردنی ئەسپ بۆ هەر لایەك، هاتوچۆکردنی ئەسپ بۆ هەرلایەك.

**جەدەل** "جدل": گفتوگۆی تیژ، دوژمنایەتی.

**جەزب** "جذب": کێشان، ئەوەی کەسێك یان شتیك بۆ لای خۆی دەکیشێ.

**جودی:** ناوی کێوێکە لە نزیك شاری موسڵەوەیە کە یەکێکی لە شارەکانی کوردستانی عێراقە، دەڵێن کەشتی نوح پێغەمبەر لەسەر ئەم کێوە لەنگەری گرتووە.

جەزبەی حەق "جذبە، حق":

## چ -

**چاك:** (١) باش، پەسەند، داوێن پاك، پیاوچاك، (٢) درز، کون، دراو، بەروك، کـونێکی گەورە لە جلوبەرگدا، یەخەی کراس.

**چاهی زەنەخدان:** چاڵی چەنە، قوڵایی ناو چەنەی هەندێ ژن.

**چاه:** چاڵاو، بیر.

**چەمی:** "هەورامی" نیوە نیگایی، نیوەڕوانینی.

**چین:** ڕێز، ڕیزێك لە شتێك، (٢) ناوی وڵاتێکی بەناوبانگە لە ڕۆژهەڵاتدا.

**چەوگان:** گۆچان.

## ح -

**حاشیە:** تەنیشت، قەراغی جلوبەرگ یا کتێب، شەرحێکی لە تەنیشت کتێب دەنووسرێ، مەبەستێکی کە لە مەتن، زیاد بکرێ.

**حەبەش:** (١) میللەتێکی پێست ڕەشە لە ئەفەریقادا دەژی، کەسـی پێـست ڕەش، (٢) کینایەتە بۆ ڕەنگی ڕەش، (٣) وڵاتی زنگبار کە خەڵکی ئەوێ ڕەنگیـان ڕەشـە، شـیعردا ڕەنگی ڕەش کینایەتە بۆ شەوە.

**حەزین** "حزین": خەمبار، دڵتەنگ، گرژ، غەمگین.

**حەریق** "حریق": سووتاو، ئەو کەسەی بە ئاگردەسوتێ، ئاگر سـووتاندن، هـاڵاو، کڵپـە. (٢) نازناوی خاوەنی ئەم دیوانەیە.

**حەرەم** "حرم": ناوەوەی خـانوو، نـاوەوەی ژوور، (٢) هـەر جێگەیـەکی کـە پیـاو دەبـێ بیپارێزێ، ئەو ژوور و جێگەیەی کە ژن و منداڵی لێ دەژی لە ماڵـدا (٣) نـاو کەعبـە، دەوروبەری کەعبە.

**حەرەمەین:** مەککە و مەدینە.

**حەقیقی "حقیقی":** ڕاست و دروست، ڕەسەن، نەژادپاك.

**حەقیقەت "حقیقت":** نەژادی شت، بنج و بناوانی شت، ڕاستی و دروستی.

**حەسرەت "حسرت":** داخکێشان، ئاخ و داخکێشان، حەیف دریغ.

**حوسن "حسن":** چاکی، باشی، جوانی.

**حەد "حد":** (١) شتێك بکەوێتە نێوان دوو شت و لەیەکتری جیایان بکاتەوە، قەراغی هەموو شتێك، دوایی و کۆتایی هەموو شتێك، سۆز، (٢) توندوتیژی، تیژی خەنجەر و شیر،(٣) جەزای گوناهکار و تاوانبار لە جەلدەلی دان.

**حەزرەت "حضرت":** (١) نزیکی، دەرباز، (٢) واژەیەکە بۆ ڕێزگرتن پێش ناوی کەسی گەورە و مەزن دەوترێ و دەنووسرێ، حەزرەتی لەولا: نیاز حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری خواین.

**حیکایات "حکایات":** کۆی حیکایەتە: داستان، سەرگوزشتە، سەروسەربردەی پێشینیان، گێڕانەوەی هەواڵ لە بابەت هەر شتێکەوە بێ.

**حیکمەت "حکمت":** فەلسەفە، قسەی بەجێ، راستی و دروستی لە هەموو شتێکدا، دادپەروەری، زانستی، ژیری و دووربینی، پەندو ئامۆژگاری.

**حوکەما "حکماء":** کۆی حەکیمە، زانا، خاوەن حیکمەت. حوجرە "حجره": (١) دوکانی بەزاز، جێگەی قوماش فرۆشتن، (٣) حوجرەی مزگەوت و دەرس خوێندن. ژووری مەدرەسە یا کاروانسەرا.

**حوققە "حقه":** قتو، سندوقی بچووکی جوان کە زێڕ و جەواهیری لە نێودا دەپارێزرێ.

**حەجەر "حجر":** (١) سەنگ، بەرد (٢) پیرۆز، یاقوت.

**حەسادەت** "حسادت": ئەو کەسەیە کـە نـەتوانێ دەوڵەمەنـدی و بـەختیاری خـەڵکی بربسینێ و ئارەزوی لەناوچوونی بکا، حەسودی بەخیلی.

**حەشەم** "حشم": خزمان و کەسان، نۆکەران و خزمەتکارانی پیاو، مەرەکان.

**حەرب** "حرب": جەنگ، شەڕ، کێشە.

**حەرەمخانە** "حرمخانە": حەرەم سەرا، ژووروسەرای گەورەکان کە جێگـەی ژنانـە، شـوێنی ژنان.

**حەمد** "حمد": ستایش، سپاس، ستایشکردن، شوکرکردن، یادکردن.

**حیرز** "حرز": (١) جێگەی قایم، پەناوپەسێو، شوێنی کە شـتێکی تێـدا بپـارێزن (٢) بەهرە، ئەو دوعایەی لە کاغەز دەینووسن و لەگەڵ خۆیان هەڵی دەگرن.

**حیرمان** "حرمان": نا هۆمێدی، بێ بەهرەبوون، بێ بەشکردن.

**حیمایەت** "حمایت": ئاگاداری لێ کردن، چاودێریکردن، پارێزگاریکردن لە شـتێك یـا لە کەسێك، پشتیوانیکردن، پاسەوانی.

**حەبیبان:** خۆشەویستان، دۆستان.

**حیفز** "حفظ": پاراستن، پارێزگاریکردن، پاسەوانی، بەرگریکردن لە لەناوچوونی شتێك، ئاگاداریکردن لە شتێك تا تێك نەچی، لەبەر کردنی شیعر یا هەر نووسـین و قـسەیەکی دیکە.

حزور "حضور": (١) ئامادەبوون، ئامادەکردن، لـە نزیـك کەسـێکدا بـوون (٢) واژەی وشەی ڕێزگرتنە لەپێش ناوی کەسی گەورە دەوترێ و دەنووسرێ.

**حوبب** "حب": وستی، عیشق، دڵداری، خۆشەویستی.

**حوباب** "حباب": (١) یلقی ئاو، گومبەزی ئاو (٢)ڕوووپۆشی پاو لە شیشە یا بلور.

**حوزن** "حزن": خەم و خەفەت، دڵتەنگی، کەسەرە.

**حوججەت** "حجة": بەڵگە، دەلیل، بورهان.

**حەی** "حي": زیندو، گیاندار، نەمر، خودا (٢) مار (٣) گوند، ئاوایی، ئاوەدانی، قەوم، عەشیرەت.

**حەیدەر** "حیدر": (١) یەکێکە لە ناوەکانی خەلیفەی چوارەمی ڕاشدین، عەلی کوڕی ئەبو تالیب (شیر، شیری قەد باریك.

## خ -

**خالیق** "خالق": بەدیهێنەر، دروستکەر، پەروەردگار، خوا، ئافەریدگار، یەکێك لە ناوەکانی خوایە.

**خاتەم** "خاتم": (١) مور، نیشانە، دوایی هەر شتێك، ئەنگوستیلە، نقیم، (٢) زاری یار، دەمی یار، شتێك کە لە عاجی فیل و ئێسکی وشتر دروستی بکەن و گوڵ و وێنەی جۆراوجۆری لەسەر بکێشنەوە.

**خاکستەر**: خۆڵەمێش، مشکی، ئەو خاکەیە کە لە ئەنجامی سووتانی دار و دەوەن دروست دەبێ و ڕەنگی بۆرە.

**خام**: خاو، نەگەیشتو، نەگەییو، هەر شتێکی کە دەستکاری نەکرا بێ و لەسەر تەبیعەتی خۆی مابێتەوە، (٢) پێستی دەباغ نەکراو، (٣) کەمەند.

**خاسسە** "خاصە": تایبەتی، هێز و توانای تایبەتی ناوەوەی کە لە شتدا هەیە، دژی گشتی.

**خاتیمە** "خاتمە": مس "خاتیم"ە، دوایی.

**خار**: دڕك، دڕۆ، چقڵ، تیغی دار و دەوەن، خاروخەس: دڕك و داڵ، خاری وەکـەنات: درووی وشتر خۆر.

**خەرابات** "خرابات": مەیخانـە، لـە بنجـدا بـە عــەرەبی "خربــات"، "کـۆی" خربــە= خەریبە" بەواتە وێرانە و کاولگە، لە کۆندا بەو ماڵانەیان ئەوت کە شوێنی مەی نۆشـی و شەراب خواردنەوە. دڵداریکردن لەگـەڵ کـە نیزەکـان بـوو، لـە زاراوەی سـۆفیایەتیدا بریتییە لە پلە و پایەی خەرابی و لەناوچوونی خووڕەوشتی نەفسانی و حەیوانی، جێگەی ئاکار و ڕەوشتی مەلەکوتی و ئاسمانی، ئەو جێیەی کە خواناسان و سالیکان لـە زنجیرەی خووڕەوشت و حاڵەتەکانی نەفسانی ڕزگار دەبن و سەرمەستی مەیی یـەك پەرسـت واتـە "وەحدەت" دەبن، خەراباتی بە ئینسانی پوخت و شـارەزا ئـەڵێن کـە گەیـشتبێتە پلـەی بەرزی عیرفان و خواناسی و ئاسەوەری.

**خدری زیندە**: خدر پێغەمبەر، ناوی یەکێکـە لـە پێغەمبـەران، لـە سـەردەمی موسـا پێغەمبەردا ژیاوە و هاوڕێی بووە، لە ئەفسانەی سامییاندا ئاوی ژیانی خواردۆتەوە هـەتا هەتایە نامرێ، لە کوردەواریدا خدری زیندەی پێ دەڵێن، ناوی ئالیایا، ئیلیا یوحن بـووە، لەبەر ئەوەی هەمیشە لە جێگەی تەوسەوزیدا دانیشتووە "خضر" یان پێ وتووە. هەروەها دەڵێن لەگەڵ ئەسکەندەری گەورە لە ئاوی ژیان گەڕاو لە خاکی زوڵماتدا سەرچاوەی ئـەو ئاوەی دۆزییەوە و لێی خواردەوە، پێ نەگەیشتە ژیانی نەمری و هەمیشەیی، لـە هـەموو دەور و زەمانێکدا لە بیاباندا بە هانای ونبووان و دەگات و یارمــەتییان دەدات، قورئـانی پیرۆز باسی کردووە، کە لە دەروێش و سۆفییاندا پایەیەکی بڵندی هەیە.

**خەرامان**: بەناز ڕۆیشتن، بەناز و فیز بە ڕێگادا ڕۆیشتن.

**خەرقە**: ئیلمە، پارچەی جل، پارچەیەکی بچووك لە قوماش جلێك لـە پارچـەی بـچووك بچووکی جۆراوجۆر دروست کرابێ، جلوبەرگی دەروێشان.

**خەراج "خراج"**: باج، ئەو ماڵەیە کە لە باتی بەکارهێنانی زەوی لە بەرهەمی کشتوکاڵ و شتی دیکە وەردەگیرێ.

**خەرقی عادەت**: پێچەوانەی خوورِوشت، لاچوون لەسەخور و رەوشت، زیادە لە رەوشت.

**خیەق "خرق"**: کۆی، خرقە=خەرقەیە: پارچە جل، جلوبەرگی دەروێشان.

**خزمەت**: کارکردن بۆ کەسێکی دیکە، نۆکەری، خزمەتکاری، .

**خەسیس**: چنۆك، چاوچنۆك، بەرچاو تەنگ، لەچەر، نان نەخۆر، نان نەدەر.

**خزان**: چوونە ناو شتێکی تەسك، لەسەر سنگ رۆیشن، رۆیشتنی جانەوەری بێ پێ.

**خەتا "خطا"**: تاوان، سوچ، نادروست، تاوان و گوناهێکی بە ئەنقەس نەکرابێ.

**خەجاڵەت**: شەرمەزاری، حەیا، شەرمنی.

**خیتابات "خطابات"**: وتوێژ قسەی رووبەڕوو ئەو قسانەی رووبەڕوو بۆ کەسێك دەوترێ، ئەو قسانەی کەسێك بە یەکێکی دیکە بلێ و ئەو وەلامی بداتەوە.

**خەتی بوتلان "خط بطلان"**: خەتی ناڕاست، دێری ناحەق، خەتی پوچ، نووسینی ناڕاست.

**خەندان**: شکۆفەی گوڵ، خونچەی گوڵ، دەم بەپێکەنین، خۆشحاڵ، دڵخۆش.

**خەڵوەت "خلوت"**: تەنیای هەڵبژاردن، جێی بەتاڵ، شوێنی خەوتن (٢) خەزان، گەڵارێزان، پاییز، یەکێکە لە چوارکەژی ساڵ، سێ مانگی پێش زستانە.

**خەلەف "خلف"**: نەوەیە، نەوەی چاك، کەسێکە لە دوای کەسێکی دیکەوە بێ، جێنشین، ئەولادی دروستکار و شایان.

**خەلیفە:** جێنشینی پێغەمبەر یان ئیمام، ئەو کەسەیە کە لە جێی کەسێکی دیکە دادەنیشێ، (۳) ناوی سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامییەکان بوو لەپاش حەزرەتی موحەممەدەوە تا ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانی.

**خلوسییەن** "خلوصیت": پاکی، خاوێنی، بێبەغەشی.

**خۆش مەنزەر** "خۆش منظر": خۆش دیمەن، ڕۆح پەروەر، دیمەنی جوان.

**خوسرەوی خوبان:** فەرمان ڕەوایی جوانان، پاشای جوانان، خوسرەوی پەرویز، نەوەی ئەنو شیروانی دادپەروەر، لە سەردەمی ئەودا پێغەمبەری موسوڵمانان موحەممەد پەیدا بووە، خوسرەو پادشایەکی خاوەن شکۆ بووە، دەوڵەمەندی و گەنجینەکانی بوون بە ئەفسانەی، دڵداری لەگەڵ شیرین بووە، بە سەرچاوەی چیرۆکی شیعری لە ویژە و ئەدەبیاتدا.

**خورشیدی تابان:** ڕۆژی ڕووناك، خۆری تروسکەدار.

**خورسەند:** خۆشحاڵ، دڵخۆش، شادمان، قانعبوون، ڕازیبوون.

**خوررەم** "خرم": دڵخۆش، شاد، خۆشحاڵ، (۲) تەرو تازەو نازدار.

**خوبان:** جوانان، چاکان، شۆخان، دڵبەران.

**خەدەنگ:** تیری ڕاست و درێژ، دارێکی سەخت و قورس و پتەو، تیر و نیزەی لێ دروست دەکرێ، (۲) دارگەز، درەختی گەز.

**خێرەد** "خرد": ئەقڵ و هۆش، زانست، خێرەدمەند: زانا، هۆشیار، بەنۆش، عاقڵ.

**خوتور** "خطور": یاد هاتنەوە، هانەوە بیر، شتێك لە بیرکرابێ و ویستووەیاد.

**خەواس** "خواس": کۆی "خاصە=خاسەیە": خزمان، کەسان و نێزیکان، گەورەکان و هەڵبژاردراوانی قەوم (۲) سوود و قازانج، خەواس بەرامبەری عەوام.

**خومار "خمار"**: ئەو ژانەسەر و سەرئێشانەی کە دوای مەی خواردنەوە بەدی دێ، دەردی سەر و سستییەکە دوای لەناوچوونی نەشئەی شەراب لە ئینساندا بەدی دێ، حاڵەتی دوای مەسی.

**خوان:** سفرە، ئەو شتەی نانی لەسەر دەخورێ.

**خەلەل "خلل"**: درز، کون، پەککەوتنی کارێك، کارێك کە چەتی ێکەوێ و پێك نەیەت، زیان و لەناوچوونی کارێك، شێواوی بیروڕا، جیاوازی، مەودای نێوان دۆست.

**خیسال "خصال"**: کۆی "خصلت=خیسلەت"ە :خووڕەوشت، عادەت.

**خەد "خد"**: ڕوومەت، کولمە، ڕووخسار گۆنا.

**خەتاو خوتەن:** ناوی ناوچەکانی باکووری چینە کە موشکی ئەو ناوە بەناوبانگ بوو.

**خونکار:** خوێنرێژ، ئەوەی خوێن دەڕێژێ، ئەوەی کەسێك دەکوژێ.

**خەیاڵ:** ئەندێشە، وەهم، گومان.

**خیلاف "خلاف"**: پێچەوانە.

**د**

دانیش: زانست، زانیاری، عیلم، دانایی.

**دانی:** نزیك، نیزیك بو، دژی "قاصی – قاسی".

**دارولحوزن "دار الحزن"**: ماڵی خەم و خەفەت، ماڵ و شوێنی کە دانیشووانی تووشی خەم وخەفەت بن.

**دەرك:** تێگەیشتن، زانین، ئاگاداربوون، شارەزابوون، حاڵیبوون.

**دەڵەك:** جانەوەرێکی گۆشت خۆرە، لە سمۆرە دەکات و هێندەی پشیلە یا ڕێوی گەورەترە، پێی کورتە، پێستی یەکجار نەرمە، ڕەنگی زەرد و قاوەیی هەیە، ژێر گەردن و سنگی سپییە، پێستی بەنرخە، لە کوردستاندا پەیدا دەبێ.

**دەلیل "دلیل":** بەڵگە، ڕێبەر، پیر، مورشید، هەموو بەڵگەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی شت، حوججە.

**دڵجو:** دڵخواز، ئەوەی دڵ پەسەندی دەکا.

**دولدول:** ژوشکی گەورە، ژوشکی تیرهاوێژ، سیخور، (۲) بە مانای کارێکی گەورەو، (۳) ناوی ئێسترێکە دەڵێن "مەقوقیس فەرمانڕەوای میسر بۆ پێغەمبەری ئیسلامی ناردو بو بەیداری حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب سواری دەبوو، هەر بەم هۆیەوە بە حەزرەتی عەلیان وتووە شای "دولدول سووار".

**دەقیق:** بارێك، نەرم، ورد، (۲) ئارد، (۳) کارێك پیاو سەری لێ دەرنەکا، کاری داپۆشراو و ئەستەم، نوکتەی باریك.

**دود:** دوکەڵ، نەرمی

**دەماغ:** مێشك، شێکی نەرم و ڕەنگ بۆری کە لەناو قاپی سەر"جوجمە" دایە.

**دەهر "دهر":** ڕۆژگار، زەمان، زەمانە، ڕۆژگاری بێ پایان.

**دەقیقی:** باریکی، نەرمی، وردی.

**دەفینە:** شاراوە، پەنهان پارە یا شێکی دیکە کە لەژێر خاکا شاردرابێتەوە، گەنجینە، خەزێنە.

**دوڕ:** دور "در": مرواری درشت.

**دورد:** خلتە.

**دیبا:** جۆرە قوماشێکی ئاوریشمییە، قوماشی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ.

**دیباچە:** سەرەتا، سەرەتای مەبەست، شەرحێکە کە لە پێشەوەی کتێبدا بنووسرێ، (٢) ڕووخسار، ڕوو، بە عەرەبی "دیباجە"ی پێی دەڵێن.

**دیار:** کۆی دار، ماڵ، شار، سەرزەمین، هەرێم، مەڵبەند، ناوچە، (٢) ئاشکرا، دیاری.

**دەهەن:** زار، دەم.

**دێرینە:** کۆن، کۆنە، پێشینە، لە مێژینە، قەدیم بوون، بەساڵاچوو، پیری لەکار کەوتوو.

## ڕ

**ڕەجا** "رجا": تکاکردن، ئومێدکردن.

**ڕەحم** "رحمت": میهرەبانی چاکە کردن، بەخشین بەزەیی.

**ڕەئیس** "رئیس": سەردار، سەروەر، سەردەستە، پێشەوا، گەورەی میللەت.

**رەشك:** غیرەت، حەسادەت.

**ڕەم** "رم": (١) رامکردن، هەڵاتن، دوورکەوتنەوە ڕاکردن لە ترسان، ڕەو، ڕەوینەوە، (٢) پەلامار، هێرش، **بەسەردادان**، ڕەمی ئاهو: سڵکردنی مامز.

**ڕەهن:** بریتییە لەو شەی کە دەدرێتە کەسێك و پارەی لێ قەرز دەکرێ، نرخی ئەو شتە هێندەی پارەکە بێ، قەرزدار شتەکەی وەردەگرێتەوە لە پاش ئەوەی قەرزەکە دەداتەوە.

ڕەحمان "رحمان": بەخشندە و میهرەبان، یەکێکە لە ناوەکانی خوای گەورە.

**ڕموز:** کۆی ڕەمزە، ئیشارەت، رازی نهێنی داپۆشراو، ئەو بزوونەوەیە کە لە ئەنجامیدا ئادەمیزاد دەرکی مەبەس دەکا. **ڕۆح:** (١) گیان، ڕەوان، نەفس، جان، (٢) فەرمانی خودا، وەحی خودا، فریشتە.

**ڕەوغەن:** ڕوون، شێکی شل یا نەرم و چەورە لە کەرە یا دوگ یا دەنکی بادام و گەرجەك و زەیتون شتی دیکە دەردەهێنرێ.

**ڕوقعه** "رقعه": نامه، نووسین، نووسراو، پارچه کاغه‌زێك، بـۆ نووسـین ئامـاده‌یی (٢) جۆره خه‌تێکی نووسـینه، (٣) پارچه‌ی هه‌موو شێك، (٤) پینه‌ی جلوبه‌رگ.

**ڕوخنه:** کون، درز.

**ڕوباب:** یه‌کێك له ئامرازه‌کانی مۆسیقای کۆنه، وێنه‌ی تاره، به‌ڵام کاسه‌که‌ی بچووکتره و له کۆنا دوو ته‌لی بووه به‌هۆی که‌مانچه‌وه لێدراوه.

**ڕیعایه‌ت** "رعایت": له‌وه‌ڕاندنی مه‌ڕومالات، له‌وه‌ڕاندنی ئاژه‌ڵ و مـالاتی گیـاخۆر لـه له‌وه‌ڕگادا، (٢) ڕاگه‌یشتن به ئیش و کار و ره‌عیه‌تان، (٣) راگرتنی ڕێزو مافی که‌سێك، دلنه‌وایی و میهره‌بانی، چاکه و یارمه‌تیدان.

**ڕیوایه‌ت** "روایت": چیرۆك، داستان، گێڕانه‌وه‌ی مه‌به‌ست، خه‌به‌ر یا حه‌دیس.

**ڕوحانییه‌ت** "روحانیـت": پـاکی و پـیرۆزی، پارێزگـاری، (٢) زانایـان و پێـشه‌وایانی ئایینی، کۆمه‌ڵی ڕوحانیانی ئایینی، ئه‌و که‌سانه‌ی پێیانوایه ڕۆح ماده نییه.

**روکن** "رکن": (١) به‌شی گه‌وره‌تر و به‌هێزتری هه‌ر شتێك ئه‌ندامی گه‌وره، ئـه‌وه‌ی کـه پێی به‌هێزبن و پاڵی پێوه ده‌ن (٢) پایه و کۆڵه‌که (٣) گه‌وره و پێشه‌وای قه‌وم.

**ڕیشته** "رشته": ڕسته، تاڵ، داو، ریزێك شتی هۆنراوه‌ی وه‌کو مرواری، ته‌ناف.

**ڕه‌قیبان:** ئه‌و که‌سانه‌ی مه‌یلیان بۆ شتێك یا که‌سێك هه‌بێ و عاشقی بن، هه‌ریه‌کـه‌یان ڕه‌قیبی ئه‌وی دیکه‌یانه، ئه‌وانه‌ی قسه و کـرده‌وه و بزووتنـه‌وه‌ی خـه‌ڵکی هه‌ڵـده‌گرن یـا تۆماری ده‌که‌ن.

**ڕیسوا:** بێ ئابڕوو، به‌دناو، بێ شه‌رم، شه‌رمه‌زاری به‌هۆی کاری ناحـه‌ز و خراپـه‌وه، ئـه‌و که‌سه‌ی که کاری خراپ و ناحه‌زی لێ ئاشکرا بێ و له‌لای خه‌ڵك شه‌رمه‌زار و بـێ ئـابڕوو بێ.

**ڕیا**: بەدرۆ خۆپیشاندان بە کەسێکی باش و داوێن پاك، خۆپیشاندان بە خێرخوا و لە ڕاستیشدا وا نەبێ، دووڕوویی.

**ڕەزان**: مێو، داری ترێ.

**ڕەزیل** "رذیل": ناکەس پەست، نزم زەبوون.

**ڕەغد** "رعد": هەورە تریشقە، دەنگی هەور.

**ڕەسەدخانە**: ئەو ماڵ و شوێنەی کە ئامراز و کەرەسەی ئەستێرەناسی تێدا کۆدەبێتەوە.

## ز

**زاهید** "زاهد": تۆبەکار، ئەو کەسەی وازی لە دونیا هێنابێ و خەریکی عیبادەت بێ، پارێزگار، پارسا.

**زات** "ذات": خاوەن، خوداوەندی هەبوون و جەوهەری هەموو شتێك نەفسی هەموو شتێك، سرشت.

**زاهیر** "ظاهر": ئاشکرا، دیار، پەیدا، نوێنراوە.

**زایع** "ضایع": بێ بەهرە، بێ سوود، بێکار، بەغیروچوو، واز لێ هێنراو، ونبوو، بزربوو.

**زاغ**: قەلەڕەشە، باڵدارێکی ڕەشە، لە قەلەسابونە بچووکترە و دەنووك و پێی سوورە، لە هاویندا دەچێتە کوێستان و شوێنی سارد.

**زانو**: چۆك، ئەژنۆ.

**زەمیر** "ضمیر": (١) ناوەوەی ئادەمیزاد، ناخی دڵ، ئەندێشە و ڕازی ناودڵ، نیهاد، دەروون، (٢) لە دەستووری زماندا ئەو وشەیەك جێگری ناوە و شەخس دەگەیێنێ، وەکو من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئەوان.

**زەمهەریر** "زمهریر": زۆر سارد، سەرمای سەخت، جێگەی یەکجار سارد.

**زەلەیخا:** ناوی ژنی پوتیڤاری عەزیزی میسر بوو، ئەوەی حەزرەتی یوسفی بە پارە کری، زولەیخا عاشقی یوسف بوو، بەڵام یوسف مەیلی بۆی نەبوو لەبەر ئەوە لای پۆتیڤاری مێردی بوختانی پێ کرد تاخستییە زیندانەوە، بەڵام لە ئەنجامدا، یوسف لە لە زیندان ڕزگاری بوو لەوکاتەی زولەیخا پیر بوو بوو، ڕۆژێ لە سەر ڕێی یوسف دانیشت و بە فرمێسك و پاڕانەوەدا وای لێ کرد کە لێ خۆش بێ و ئیمانیشی بە پێغەمبەرایەتی هێنا، ئیتر یوسف دۆعای بۆ کرد و گەنج بووە و شوویان بەیەکتری کرد، لە قورئاندا باسی ئەم ڕووداوە نەکراوە.

**زوهرە** "زهرە": ناهید، وینوس، نزیکترینی ئەستێرە گەڕۆکەکانە لە زەوی ئێمە، لەپێش ڕۆژهەڵات و لەپاش ڕۆژئاوا لە ئاسماندا دەبینرێ، ماوەی بزوتنەوەی لە دەوری ڕۆژدا "٢٢٥" ڕۆژە، دوو ئەوەندەی عەتارید و هەندێ لە زەوی ئێمە بچووکترە، گۆرانیی فیکر و سەماکەری چەرخ و فەلەکی پێ دەڵێن.

**زەوال** "زوال": لەناوچوون، لەبەینچوون، دوورکەوتنەوە، پاکبوونەوە.

**زومرە** "زمرە": دەستە، پۆل، کۆمەڵ ، گروە.

**زەرف** "ظرف": لە زانستی "سەرف=صرف" دا هەموو شتێك کە شتێکی دیکەی تێدا بێ، ئەوەی مانای "لە"ی تێدایە، دووبەشە، جێگە و کات، (٢) بلیمەتی، پسپۆڕی (٣) قاپ، هەموو شتێك کە شتێکی دیکەی بخرێتە ناوەوە، (٤) حاڵ، وەزع.

**زەکات** "زکاة": =زکوە: خوالاسە و هەڵبژاردەی شتێك بە شتێك لە ماڵ کە بە دەستوور و فەرمانی شەرع لە ڕێی خودا بیدەن بە فەقیر و هەژار، لە زاراوەی "فیق ـ فیقە"دا بەشێکی دیاری لە ماڵەکە دەبێ بیدەن بە هەژاران و ئەوانەی خێریان پێ دەشێ.

زەڕرە "ذرە": (١) شتی یەکجار بچووک، (٢) هەر یەکێک لەو شتە بچووکانەی لە هەوادا بڵاون و لەبەر تیشکی ڕۆژ دیار دەبن.

زیارەت "زیارة": چوونە لای کەسێ گەورە و پایە بڵند بۆ دەست ماچکردنی، چوونە لای شێخان و پیاوچاکان و خوانناسان بۆ دەست ماچکردنی، چوونە سەر ئارامگا و گۆڕی پیرانی پیرۆز و پیاوچاکانی مردوو.

زینەت: جوانکردن، هەر شتێک کە شتێکی دیکەی پێ جوان بکرێ، ئارایش.

زەنگ: (١) ژەنگ، ئەو شتەیە کە لە ئەنجامی هەوا و تەڕایی لەسەر ئاسن پەیدا دەبێ، کارکردنی ئۆلسیژین لە ئاسن، (٢) تیشکی مانگ و ڕۆژ، (٢) کەسی خەڵکی زەنگبار کەناوی وڵاتێکە لە ئەفریقا دانیشتووانی ئەوێ پێستیان ڕەشە ٤٩٩ زەنگوڵە.

زەنگی: نیسبەتە بۆ زەنگ یا زەنگبار کە ناوی وڵاتێکە لە ئەفریقا و خەڵکەکەی پێست ڕەشە، لە کۆنا بە هەموو ڕەشەکانیان دەگوت زەنگی، ڕەشی لوولەوار.

زیا "ضیاء": ڕۆشنایی، ڕووناکی، ترووسکایی، تریفە.

زەغەن: باڵدارێکە لە قەلەڕەشە دەچێ و بچووکترە، جانەوەری بچووک دەکوژێ، مێشک ڕاو دەکات و چۆلەکەی ڕەشیشی پێ دەڵێن

زیکر "ذکر": (١) هاتنەوەیاد، وەبیرهاتنەوە، (٢) ناوهێنان، (٣) ستایش و سوپاس، نوێژ، وێرد و دوعا.

زەمیمە "ضمیمة": پێوەلکێنەراو، پێوەنوساو، پێوەچەسپاو.

زوڵفەقار "ذوالفقار": ناوی شمشێری حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیبە.

زوڵەمات "ظلمات": کۆی "ظلمت=زوڵمەت"ە، تاریکی دواکەوتوویی، نەوینەدەواری، پێشینان و قەدیمان پێیانوابوو کە زوڵمات لە ئاخری زەوی دایە و سەرچاوەیەکە کە هەر

کەس ئاوی ئەم سەرچاوەیە بخواتەوە ژیانی هەمیشەیی دەستدەکەوێ، هەر بەم هۆیەوە ئەم سەرچاوەیان ناوناوە ئاوی حەیات و وتوویانە کە ئەسکەندەر چوو بە شوێن ئاوی حەیاتدا، بەڵام نەیگەیشتێ و خدر پێغەمبەر لە ئاوی ئەو سەرچاوەی خواردەوە و ژیانی هەمیشەیی دەستکەوت، جوگرافیانووسانی کۆن زوڵەماتیات بە قوتبی شیمال دانـاوە، چـون مـاوەی شەشە مانگ لەساڵدا لەو شوێنەدا هەوا تاریکـە و بـە بیروبـاوەڕی ئـەهلی تەسـەووف مەبەست لە هەوای نەفسانی و خووڕەوشتی حەیوانییە.

**زەفەر** "ظفر": هیـوا و ئامـانج هاتنـەدی، بـە ئـاوات گەیـشتن، بـە مـەزار گەیـشتن، سەرکەوتن.

**زەوق** "ذوق": (١) چێژ، تام (٢) خووڕەوشت (٣) خۆشی، دونیایی.

**زیللەت** "ذلت": چارەڕەشی، بەدبەختی، پەستی، گومڕایی، ڕێگە ونکردن.

**زیقەتخانە** "ذیقتخانە": ماڵی تەنگ و تاریك.

**زیشت:** ناحەز، ناجوان، ناپەسند، ڕووناحەز، بەددیمەن.

**زەیستان:** ژنی تازە زاو.

**زیبا:** جوان، ڕووجوان، دڵبەر، دڵفڕێن، شۆخ.

**زەقەن،** "ذقن": چاڵی چەنە.

**ژ-**

**ژولیدە:** خەمگین، پەرێشان، لێقەوماو، سەراوژێر، لێقەوماو.

**س -**

ساقی: (١) ئەو کەسەی ئاو یا شـەراب بـە یـەکێکی دیـك دەدات، ئـەوەی لـە کـۆڕی مەینۆشیدا مەی لە پیاڵە دەکات و دەیـدا بـە دەسـتی مـەی نۆشـان، (٢) لـە زاراوەی

سۆفیەتیدا ڕابەری ڕاستەقینە، مورشیدی حەقیقی "کە ئەمە خوا خۆیەتی: وەکو لە قورئاندا هاتووە "وسقاهم ربهم سرابا طهورا"، (٣) پیری پوخت و شارەزا کە فەیز و بەهرە بە مریدەکان دەگەیەنێ.

**سالیك** "سالك": ڕێبوار، پەیڕەو زاهید، سۆفی، دەروێش، ئەو کەسەی دەڕوا، ئەو کەسەی ڕێیەك دەگرێتە بەر و بەو ڕێیەدا دەڕوا، لە زاراوەی سۆفیزمدا ئەو کەسەی کە بە ڕێنوێنی پیر و مورشید بە ڕێی خواناسی و پارێزگاریدا بڕوا و سلوك بەیتییە لە گەڕان لە پلە و پایەی وجوددا بۆ گەیشتن بە ڕاستی و دروستی، لە مەرجەکانی ئەو بریتییە لە ڕەنج و زەحمەت و گۆشەگیری و عیبادەت و شەو نەنووستن و دوورکەوتنەوە لە هەوای نەفس، بە سالیکان ئەهلی سلوك و ئەهلی تەریقەتیشیان پێ دەڵێن.

**سالح** "صالح": چاك، دروستكار، ڕاست و کردەوە چاکە،

**سامان:** دەوڵەت و ماڵ، ئەسبابی دەوڵەمەندی، (٢) ڕێکوپێکی، جوانی، (٣) نیشانە و ئەندازە، (٤) هێمنی و لەسەرخۆیی، (٥) هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری (٦) ناوی کەسێك بوو کە بنەماڵەی پادشایانی سامانی دروستکرد.

**ساغەر:** جام، پیاڵەی شەراب خواردنەوە، کاسەیەك بۆ مەی خواردنەوە کە لە بلوریا زێڕ و زیو یا شتێکی دیکە دروستکرا بێ، لە زاراوەی سۆفیایەتیدا شتێکە کە لەودا نووری غەیبی و نهێنی ببینن و لە واتا و مەعنەویات بگەن، دڵی خواناس و عارف.

**ساری:** (١) کارکردن لە شتێك بە جۆرێك کە بە هەموو لایەکدا بڵاوببێتەوە، (٢) ئەوەی بە شەودا دەڕوا، شەوڕەو، دەرچوون لەو دیو، لە زاراوەی پزیشکیدا نەخۆشییەك لە کەسێکەوە بە کەسێکی دیکە بگات.

**سالار:** سەرۆك، سەردار، ڕەئیس، سەرۆكی میللەت، گەورەی قەوم، گەورە و پێشڕەوی کاروان یا لەشکر، قافڵە سالار، لە زاراوەی کشتوکاڵدا وەرزێری ئاگادار و کارامە کە بە کاروباری زەوی و ئاوداشتن و کشتوکاڵ ڕابگات.

**ساکین** "ساکن": ئارامگرتوو، بێ بزووتنەوە، نیشتەجێ، موقیم، دانیشتوو.

**سەبات** "ثبات": قایمی، ڕاست و دروستی، نەگۆڕین، بیروڕا نەگۆڕین.

**سەرراف** "صراف": (١) ئەو کەسەی کە پارەی ساغ لە پارەی قەڵب جیادەکاتەوە، زێڕناس، (٢) ئەو کەسەیە کە پارە دەگۆڕێتەوە، ئەو کەسەیە کە بازرگانی کڕین و فرۆشتن بە پارە دەکا.

**سەرف** "صرف": زانستێکە بە بابەت پیشتیاقی وشەی عەرەبییەوە (٢) بڵاوکردنەوە، خەرجکردن، خەرجکردنی ماڵ و پارە، (٣) دەرهێنانی شتێك یا کەسێك لە جێگەیەك.

**سڕ** "سر": ڕاز، نهێنی، نهێنی دەروون، شتی داپۆشراو و نەبینراو.

**سەرمایە:** پارەوپول و ماڵی بازرگانی، ئەوەی ئاڵوێری پێ دەکرێ.

**سەمەر** "ثمر": بەر، میوە.

**سەفینە** "سفینة": کەشتی، پاپۆڕ.

**سەلات** "صلاة": نوێژ و پاڕانەوە لە لایەن بەندەوە لە خودا، ڕەحمەتی خوا بە بەندەکانی.

**سەلا** "صلا": وشەیەکە بۆ بانگکردنی خەڵکی بەکاردەهێنرێ، بانگکردنی خەڵك بۆ کارێك، نوێژکردن، (٢) ئاخواردن.

**سەررشتە:** سەری هەوادا، ڕێگەی کار، سەرکەوتن و زانینی کار شارەزایی و کارامەیی لە کاردا (٢) دەفتەری حیساب.

**سەدارەت** "صدارت": جێگەی بەرز، گەورەیی، پلەی سەرۆکی وەزیران، سەدری ئەعزەم، بالآنشین.

**سیلاح** "سلاح": چەك، هەموو ئالەتێکی کە لە شەڕدا بەکاربهێنرێ، تەقەمەنی.

**سیفات** "صفات": کۆی "صفت=سیفەت"ە: چۆنیەتی ئەو شتەیە کە چۆنیەتی شتێك یا کەسێك دیاری بکات.

**سوجدە** "سجده": نێوچاوان گەیاندنە سەر زەوی بۆ مەبەستی عیبادەت و خۆ بە بچووك و نزم پیشاندان، کڕنۆشبردن.

**سوحبەت** "صحبت": هاودەمی، هاوڕێیەتی، وتوویژ، گفتوگۆ.

**سوبحان:** بە پاکی یادی خواکردن، حەزرەتی سوبحان: خوای پاك و بێ عەیب، سوبحانی: خودایی، ئیلاهی.

**سولوك** "سلوك": گرتنی ڕێگەیەك و لەسەری ڕۆیشتن، ڕەفتار، ڕەوشت، ڕێڕەو، بۆ تەریقەت بەکاردەهێنرێ.

**سریشك:** فرمێسك، ئەسرین، دڵۆپە دڵۆپەی ئاوی چاو کە لە کاتی گریاندا دەڕژێتە خوارەوە.

**سۆفی** "صوفی": دەروێش، شێخ، مرید، ئەو کەسەیە کە پەیڕەوی تەریقەتی سۆفی "سوفیزم" دەکات، پەشمینەپۆش. یەکەم کەس کە پێیان وتووە سۆفی ئەبو قاسمی سۆفی بووە کە لە ساڵی ١٦٠ی کۆچی مانگی، کۆچی دوایی کردووە و یەکەم کەس کە واژەی سۆفی لە کتێبەکەی خۆیا هێناوە عەمر و بنی بەحری جاحیز بووە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی کۆشی دا ژیاوە.

**سروورسور:** کەیف و خۆشی، شایی و زەماوەند، شادیی و کامەرانیی، گوشادی و دڵخۆشی.

**سوره**: فەسل یا پارچەیەکی سەربەخۆ لە کتێب، بەشێك یا پارچەیەك لە قورئـان، هـەر کام لە سەد و چواردە فەسڵەکانی قورئانی پیرۆز، سورەی یوسـف: پارچـە و بەشـێك لـە قورئان کە باسی حەزرەتی یوسف دەکات.

**سەیقەل** "صیقل": مشتومالکردنی شیر و خەنجەر، پاککردنەوە و تیـژکردن و بریقـەدان بە شیر و خەنجەر.

**سەفسەتە** "سفسطة": وەرگیراو لـە یۆنـانی، بەڵگـە و قیاسـی باتـڵ و نادروسـت بـۆ پێچەوانە نیشاندانی ڕاستی.

**سیفە** "صیفة": جۆر، ئەسڵ، شێوەی هەر شتێك لە قاڵبی ڕێژدراودا، لە زاراوەی سەرفی عەرەبیدا شێوە و شکڵێك کە بە کەم و زیادکردنی پیتەکان یا گۆڕانی حەرەکەکان دەدرێ بەواژە، وەکو سیفەی موفرەد، سیفەتی تەسبیە، لە زاراوەی فیقدا کاتی معامەلە و کڕین و فرۆشتن و بەستنی نیکاح بەسەر زمانیدا دەهێنن وە بەڵگـەی ڕازیبـوونی هەردوولایـە (٢) ژنێك کە هەمیشەیی نەبێ، ژنێکی کە بۆ ماوێکی کەم و دیـاریکراو لـە پیاوێـك مارە بکرێ.

**سیفەی تەرازی**: چۆنیایەتی ڕازیبوونی دە کەس.

**سەدەف** "صدف": گیاندارێکی بچووکە لەنێو ئاودا دەژی، لاشەی لەنێو توێکڵێکدایـە پێی دەڵێن "سـەدەف" ئەو گیانـدارە چـەند جـۆری هەیـە، بـەناوبانگترینیان سـەدەفی مرواریـە کە مادەیەك لە نێو لەشی خۆیدا دێنێتـە بەرهـەم ئـەو مادەیـە وردە وردە ڕەق دەبێ و مرواری لێ پێك دێ، بۆ دروسـتکردنی ئەنگوستیلە و زیوەر و هەندێ شتی جوان و ڕازاوە لە توێکڵی ئەو گیاندارانە سـود وەردەگرن، سەدەفی سـەدوچواردە لیزگەکینایە لـە قورئانی پیرۆزە کە سەدوچاردە سورەی هەیـە، سـەدەفی ئـاگرین کینایـە لـە خـۆرە کـە

سەدەفی فەلەك و سەدەفی ڕۆژیشی پێ دەڵێن. سەدەفی مرواری لە ئۆقیانوسی گەورە و ئۆقیانوسی هیند و خەلیجی فارسدا بە زۆری هەیە.

**سەمی یی** "سمیی": هاوناو، هاوتا.

**سەلەف** "سلف": ڕابردوو، لە ڕابردوودا، هەرکەس کە پتر ژیابێ لە باوکان و خزمانی کەسێك.

سەدا و سەیتە "صداوصیتە": دەنگ و ئاواز، بانگ و ئاوازێك کە لە کێو یا شوێنێکی دیکەوە دەنگداتەوە و دووبارە ببیسرێتەوە.

**سورمە**: کل، چەشنە خۆڵێکی نەرم و ڕەش و وردە بۆ ڕەشکردنی برژانگ و ڕشتنی چاو بەکاردەهێنرێ.

**سوبحی ئەمەل**: "صبح امل": بەرەبەیانی ئارەزوو، بەرەبەیانی ئاوات.

**سەید** "صید": راو، شکار، راووشکار، نێچیر.

**سولتان** "سلطان": (۱) فەرمانڕەوا، پادشا، مەلیك، (۲) بەڵگە، هێز و توانا.

**سەییاد** "صیاد": ڕاوکەر، ڕاوچی، شکارچی.

**سەرئەفکەندە**: شەرمەزار، سەرنەوی.

**سەعادەت**: بەختیاری، کامەرانی، خۆشبەختی، دژی بەد بەختی.

**سەقەر** "سقر": دۆزەخ.

**سەنا** "ثناء": ستایش، مەدح.

**سەییار** "سیار": گەڕۆك، کاروان، قافڵە.

**سیم تەن**: لەشی سپی زیوین، بەدەنی سپی وەك زێو.

**سیما**: وێنە، ڕووخسار، نەقش، شێوە، شکڵ.

**سەبیل** "سبیل": ڕێگە، ڕێ، ڕێگەی ئاشکرا.

**سەرچڵ**: (١) شێت و سەرسەری، (٢) سەرلق.

**سرایەت** "سرایت": بڕوانە ساری.

**سەبا** "صبا": (١) بای شەماڵ، بایەك کە لە ڕۆژهەڵاتەوە شنەی دێ.

**سەفەر** "سفر": بڕینی ڕێگە، لە شارێك بۆ شارێك چوون.

**سەعی** "سعی": (١) تێکۆشان، کارکردن، (٢) چوون، ڕۆیشتن، (٣) ئەو ڕاکردنەیە لە کاتی حەجدا لەنێوان "سەفا و مەروە".

**سەنەم** "صنم": بت.

**سفیدەی** سوبح: ڕووناکی بەیانی، ڕووناکایی بەرەبەیان.

**سەبو**: گۆزە.

**سەحیفە** "صحیفە": نامە، لاپەڕەی کتێب، کتێبی بچووك، گۆڤار، ڕۆژنامە.

**ستوون**: کۆڵەکە.

**سەعب** "صعب": سەخت، کاری سەخت، ئەو شتەی بە سەختی بێتەدی.

**سەفا** "صفاو": سافبوون، پاك و ڕووناك، پاکی و خاوێنی، ڕەوشەنی، ڕووناکایی، بەرەو، خۆشی و شادی، یەك ڕەنگی.

**سەهبا** "صهبا": پیاڵە، پیاڵەی شەراب، جام.

**سەودا**: ڕەشایی، تاپۆ، ڕەشایی خەڵك، کەس، ڕەشایی شارێك کە لە دوور دێتە بەرچاو.

ش -

**شاهید** "شاهد": بووك كچی جوان، مەعشوق، دڵبەر، (٢) گەواه، ئەوەی ڕووداو و کارەساتێك بە چاوی خۆی دەبینێ و گەواهی دەدا، حازربوون.

**شام:** (١) سەرەتای شەو، ئەوکاتەی کە تازە تاریکی دەستپێدەکات، کینایەتە بۆ ڕەشی و تاریکی (٢) خواردەمەنی ئێوارە و شەو (٣) وڵاتی سوریا، شاری دیمەشق.

**شامات:** کۆی "شام"ە بڕوانە شام (٢) کۆی "شامە"یە خاڵ، (٣) شامرد، مردنی شا، زاراوەیەکە لە یاری شەترەنج بەکاردەهێنرێ، (٤) ناوچەیەکە سەر بە مەهاباد.

**شەرارە:** بلێسە، پڕوشکە، ئەوەی لە ئاگرەوە بۆ هەوا بەرز دەبێتەوە، قرچە.

**شەمس** "شمس": خۆر، ڕۆژ، شوعلە، بلێسە، گڕ، زمانەی ئاور.

**شەوق** "شوق": ئارەزوو، مەیل، تاسە، ئیشتیاق، ڕەغبەت، بیرکردن، یاد، نیاز، (٢) ڕووناکی، تیشك.

**شەعر** "شعر": موو، مووی ئادەمیزاد، تووك و مووی ئاژەڵ.

**شەوی قەدر:** شەوی عیبادەت و مانگی قەمەری، سی شەوی دوای مانگی قەمەری کە مانگ دیارنامێنێ، شەوێکە لە مانکی ڕەمەزاندا، شەوی پاڕانەوەیە، قورئانی پیرۆز، لەو شەوەدا بۆ پێغەمبەر هاتۆتە خوارەوە.

**شەریف** "شریف": خاوەن شەرەف، بەڕێز و بەحورمەت.

**شەرەفیابی:** بە خزمەت کەسێکی گەورە گەیشتن.

**شەکیب:** سەبر و ئارام.

شیلی: نیسبەتە بەشبلە، لە ئاواییەکانی "ما وراء لنهر".

**شورب** "شرب": خواردنەوە، ئاو خواردنەوە.

**شەجەر** "شجر": دار، درەخت.

**شەعیر** "شعیر": جۆ، شەبیهە، وێنە.

**شەفیع** "شفیع": تکاکار.

**شەکوە** "شکوە": گلەیی، سکاڵاکردن، شکایەت (٢) جۆرە نەخۆشیەکە.

شوهود "شهود": کۆی شاهید بڕوانە شاهید.

**شیعر** "شعر": قسەی بەکێش و قافیە و هۆنراوە، ئەو قسەیەی کێش و قافیە و خەیاڵی تێدایە.

**شیعار** "شعار": دروشم، وێنە، عەلامەت.

**شەهد** "شهد": هەنگوین.

## ع -

**عالەم** "عالم": (١) جیهان، خەڵق، (٢) فەلەك، ڕۆژگار، دونیا و ئەوەی تێیدایە.

**عارم**: نەنگ، شەرم، عەیب.

**عاریز** "عارض": (١) پێشاندان، ڕووداو، سەردەستەی لەشکر، پەیدابوون (٢) ڕوو، ڕووخسار، ڕوومەت، دەموچاو.

**عەبەس** "عبث": کاری بێ هودە، کاری بێ سوود، کردنی شتێك کە سوودی تێدا نەبێ.

عەسەس "عسس": کۆی "عاس"ە (١) پاسەوانی شەو، شەو گەرد، ئەوەی شتە و دەگەڕێ بە مەبەستی پاسەوانی، (٢) دز.

**عیسمەت** "عصمت": خۆپاراستن لە گوناه، تاوان و گوناه نەکردن، ڕێگرتن لە خراپە، پاکی.

**عەسا "عصا"**: گۆچان، ئەو دارە سەرخوارەیە کـە لـە کـاتی ڕۆیـشتندا بـە دەسـتەوە دەیگرن و یاریدەی ڕۆیشتن دەدا، **عەسای موسا**: گۆچانی حەزرەتی موسا.

**عیسیان "عصیان"**: سەردانەنواندن، یاخیبوون، بە قسە نـەکردن، فـەرمان نەهێنانـە جێ، غەزرین.

**عەسر "عصر"**: (١) کاتی دوای نیوەڕۆ تا ڕۆژئـاوابوون، (٢) ڕۆژگـار، خـول، چـەرخ، دەور، سەدە، دەهر، (٣) گوشینی شتێك بۆ مەبەستی ئەوەی ئاو یا شیری دەربهێنرێ.

**عوشرەت "عشرت"**: دۆستایەتی، تێکەڵبوون، ژیان لەگـەڵ یەکتریـدا، ژیـانی خـۆش، ژیانی بەختیاری.

**عەقار "عقار"**: ماڵ، کەرەسەی ناوماڵ (٢) ئاو و زەوی کشتوکاڵ.

**عوقار "عقار"**: (١) ماڵ، کەرەسەی ناوماڵ، ماڵی هەڵبژێردراو، (٢) شەراب، مەی.

**عەرسە ."عرصە"**: حەوشە، گۆڕەپانی ناو خانوو، گۆڕەپـانی پـێش قەسـر و باڵەخانـە، مەیدان.

**عەقڵ "عقل"**: هۆش، ئەو هێز و هەستەیە لە ئادەمیزادا کە جوانی، ناشیرینی ، کـاری چاك و خراپ لە یەکتری جودا دەکاتەوە، عەقڵی کول: عەقڵی تەواو.

**عینان "عنان"**: جڵەو، ئەو پەتەیەکە بە لغاوی ئەسپەوەیە و سوار بە دەستی دەیگرێ.

**عینایەت "عنایت"**: ڕێ پێشاندان، پاراستن، دەستگرتنی یەکێك لە پێناوی ئەوەی لـە کارێکدا سەربکەوێ، وردی لە کارکردندا.

**عەتتار "عطار"**: عەترفرۆش، ئەو کەسەی عەتر و دەرمانی بۆنخۆش دەفرۆشێ.

**عیقد "عقد"**: (١) ملوانکە، گەردانە، گەردن بەند، عیقـدی سـورەییا (عقـد ثریـا): چەند ئەستێرەی ڕووناك و تروسکەدار کە بـە شـێوەی ملوانکـە دیـاری دەدەن و شـێوەی

گەردن بەند پێك دێنن، پەورین عیقدی مونەززەم "عقد منظم": رستە رێکوپێك، رستە مرواری رێکوپێك.

**عیشوە:** کاری داپۆشراو، کاری نادیاری، ناز، دڵبەری، نازفرۆشتن.

**عوقبا** "عقبی": جەزا، سزای کردەوە، دوایی هەر شتێك دوایی هەر کارێك، ئاخیرەت، ڕۆژی دوایی، ڕۆژی لێ پرسینەوە، دنیای دیکە.

**عەد** "عد": ژمارەکردن، بژاردن.

**عوسات** "عصات": کۆی "عاسی-عاصی": گوناهکار، تاوانبار، خاوەن گوناح.

**عەدالەت** "عدالت": دادگەری، بە ئینساف بوون.

**عەقرەب** "عقرب": دووپشك، ناوی بورجی هەشتەم لە دوازدە بورجەکانی ئاسمان.

**عورزە** "عرضة": لێهاتوویی، هیمەت، هێز و توانایی، (٢) مەکروفێڵ.

**عود** ": (١) دار، لقێکی لە درەخت جودا دەبێتەوە، (٢) ناوی یەکێك لە ئامرازەکانی مۆسیقایە (٣) ناوی درەختێکە لە هیند و بیرمانی دەڕوێ، دارەکەی قاوەیی ڕەنگ و بۆن خۆشە، ئاگری لێدەدەن بۆ ئەوەی بۆنی خۆش بێت، عودی قوماری: جۆرە عودێکە، نیسبەتە بۆ "قومار" یا "کۆمار" ناوی شارێکە لە وڵاتی هیندستان .

**عەجوز**"عجوز": پیرێژن، ژنی پیر، ژنی بەساڵاچوو.

**عەلایق** "علائق": کۆی "عەلاقە" بە هەموو شتێکی پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە هەبێ وەکو ماڵ و منداڵ، پێوەندی دۆستایەتی، خۆشەویستی، عیشق، ئەوین.

**عەفو** "عفو": لێخۆشبوون، لێبوردن، بەخشین، لە گوناهی یەکێك خۆش بوون.

**عەدو** "عدو": دوژمن.

**عید**: جەژن، ڕۆژی جەژن، هەر ڕۆژێـک کـە دەبێتـە مایـەی خۆشـی و شـادی کۆمەڵـە کەسێك، عیدەنیا: لە جەژنی ئێمە.

**عیرفان** "عرفان": ناسین، خواناسی، ناسەوەری، عیرفان بە مانـای گـشتی شـارەزایی و ئاگـاداربوون لـە وردەکـاری و نهێنییـەکانی شـتێکە، بەرامبـەری زانـستی ڕواڵـەتی و چینایەتی، بە وێنە دەڵێن فلان کەس پزیشکی عاریفە، واتە هەر بە نووسراوە و خوێندەوە ڕازی نابێ، با یافلان عارف، چا زان و قسەزانێکی عارفە، واتە تەنیا بە لاساییکردنەوەی ڕواڵەتی قانیع نابێ، جوانی وردەکاری قسەزانی و چـازانی فێربـووە، عیرفـان بـە مانـای تایبەتی، دۆزینەوە و بەدەستهێنانی ڕاستی شت، بە شێوەی دیتن و دۆزینەوە، بەم هۆیـەوە سۆفیایەتی واتە تەسەووف لە بنەڕەتدا یـەکێك لـە تروسـکەکانی عیرفانـە سـۆفییاتی نەحلەْ شێوە و ڕێگا و ڕێبازێکی کردەوەیی یە کە سەرچـاوەکەی لـە عیرفانەوەیـە، بـەڵام عیرفان مانایەکی گشتی و تێکڕایی ترە، کە بریتییـە لـە سـۆفیایەتی و نەحلـەکانیش، دەگرێتەوە، بە عیبارەتێکی دیکـە نیـسبەتی نێـوان سـۆفیایەتی و عیرفـان بـە قـەولی مەنتیقیان. بەو مانایە بۆی هەیە و ئینسانێك و کەسێك عارف بێ، بەڵام سـۆفی نـەبێ، هەر وەکو بۆی هەیە کەسێك بە ڕواڵەت چووبێتە ڕێگە و ڕێبازی تەسەووفەوە، بـەڵام لـە عیرفان و خواناسی بەهرەیەکی وەرنـەگرتبێ، جـاری وایـە دیومانـە واژەی عارفیـان لـە مەعنادا بەرزتر و بەڕێزتر لە واژەی دەروێش و سۆفی بەکارهێناوە.

**عناسر** "عـناصر": (١) ماك، ڕەگەز، ڕیشە، بنەڕەت (٢) چوار عونـسوری پێـشینان، بریتییە لە ئاو، با، خاك، ئاگر.

## غ -

**غایب** "غائب": نادیار، دوور لە پێش چاو، لە جێگە نەبوون، ناپەیدا، ئەو کەسەیە کە ئامادە نییە و لە جێیەکی دیکە.

**غافڵ** "غال": بێ ئاگا، نا هۆشیار، ئەوەی زوو شتی لە بیر دەچێتەوە، بێ خەبەر، فەرامۆشکار، ئەوەی لە گوێی گا دا نووستوە و ئاگای لە خۆی نییە.

**غارەت** "غارت": تالانکردن، بەتالان چوون، بەسەرداداان، هێرشبردن.

**غایەت** "غایت": دوایی، دوایی هەر شتێك، مەبەست، ئاوات، ئامانج، ئارەزو.

**غەزەل** "غزل": جۆرە شیعرێکە لە ڕووی ڕووخسارەوە هەموو دێڕەکانی لەسەر یەك کێشی عەروزی و یەك قافیەیە، ژمارەی دێڕەکانی لە حەوت کەمترە و لە پازدە زیاتر نییە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە باسی دڵداری و عیشقبازییە لەگەڵ ژناندا (٢) هەموو قسیەکی جوانی ئەدەبی کە بۆ وەسف و دڵداری و ئەویندارى لەگەڵ ژناندا دادەنرێ، (٣) قوماشێکی نەرمی ئاوریشمییە حەریق دەڵێ:

کەوا پارچەی غەزەل دەبڕی "حەریق" ئەمڕۆ لە دیوانت.

دەڵێی هەر چاوەڕێی دەستە خەیاتەی زولفی تاتاتم.

**غەزال**: مامز، ئاسك.

**غەوغا**: (١) خەڵکێکی زۆری تێکچڕژاو، خەڵکی پەستی ئاژاوەچی، هەراوهەوریا، دەنگ و سەدا لە کاتی شۆڕش و جەنگدا کە خەڵکی بەگژ یەکدا دەچن.

غینا "غناء": (١) گۆرانیی، ئاوازی خۆش (٢) دەوڵەمەندی، خاوەنی ماڵ و سامان.

**غەفڵەت** "غفلت": فەرامۆشکردن، لەیادبردن، فەرامۆشکاری، بێ خەبەری، سستی و کەم تەرخەمی، بێ موبالاتی.

**غولغول** "غلغل": ناوی دەنگ دەنگ و سەدای باڵداران، هەراوهۆریای تێکچڕژاو، دەنگی جۆشینی ئاو یا هەر شتێکی شل.

•

**غوسه** "غصه": خەم و خەفەت، ئەو خەفەتەی گەروو دەگرێ، خەم و خەفـەت لـە دڵ دار راگرتن.

## ف ـ

**فاني**: نەبوون، لەناوچوو، نابود، بەرامبەری باقی (٢) ناپایەدار، بێ دەوام، ئەو کەسـەی کە لە ڕێی ناسینی خوا و گەیشتن بە دڵ و دڵخواز لە خۆی ببورێ و لە مەعشوقدا فانی ببێ بۆ ئەوەی بەقای دەستکەوێ، پیری بەساڵاچـوو، پـیری کـەوتوو، دنیـای مـاددی کـە ناپەیدار و بێ دەوامە.

**فاسیق** "فاسق": گوناهکار، تاوانبار، کردەوەی ناڕاسـت (٢) پیاوێـك لەگـەڵ ژنـی بـە مێرد حەز لێکردن و دۆستایەتی بکات.

**فانۆس**: چرایەکە لە مەعدەن و شیشە یا کاغـەز یـا شـتێکی دیکـە دروسـت دەکـرێ، چرایەکە بۆ ڕووناککردنی ماوەی زۆر لە ژوور منارە یا جێی دیکە دایدەمەزرێنن.

**فاعیل**: بەجێهێنەر، کردنی کارێـك، کەسـێك کـە کارێـك ئـەنجام بـدا، **فـاعیلی موختار**: بەجێهێنەر و بەڕێوەبەری کارێك کە کارەکەی لەژێر دەسەڵات و ئـیرادەی خـۆی دابێت، ئەو کەسەی کارێك بە دەسەڵات و ئیرادەی خۆی بـەڕێوە ببـات و نەگـەر نەیـەوێ ئەنجامی نەدا.

**فەتح** "فتح": کردنەوە، ڕزگارکردن.

**فەساحەت** "فصاحت": ڕەوانبێژی، دەمەوەری، زمانی تیژ، زمـانی گـەرم، لـە زانـستی بەدیع دا مانای ئەوەیە کە قسە لە هەموو کەموکوڕییەك دوور بێ لە ڕووی سفتی وشـە و بەهێزی تەعبیرەوە.

**فەتتاح** "فتاح": ئەوەی یەکجار کاری خەڵك ئاسان دەکا، ئەوەی خەڵك سەردەخا (٢) یەکێکە لە ناوەکانی خودا، کارگوشا، یاریدەدەر، حاکم، داوەر.

**فەنا** "فناء": نەبوون، نەبوونی، نابودی، دژی بوون.

**فەرەح** "فرح": شادی، شادمانی، خۆشی.

**فیراق** "فراق": جودابوونەوە بەیەکتری، جودایی، دووری، شەوی فیراق، شەوی لەیەکتر جودابوونەوە، ئەو شەوەی دڵدار و دڵبەر پێکەوە نەبن.

**فەسل** "فصل": (١) جوداکردنەوە، پارچەکردن، بڕین (٢) قەدەغەکردن لەنێوان دوو شت، ئەو جێیەی دوو ئێسقان پێیدا دەگەنە یەکتری، (٣) بەشێك یا پارچەیەکی سەربەخۆ لە کتێب، (٤) کەژ، وەرز، یەکێك لە چوار بەشەکەی ساڵ کە بەهار و هاوین و پایز و زستانە.

**فەتتان** "فتان": زۆر فیتنە ئەنگێز، زۆر جوان و دڵڕفێن کە بەناز و جوانی ڕوو شەیدا بکات، (٢) شەیتان (٣) دز، ڕێگر.

**فیترەت** "فطرت": سروشت، تەبیعەت، خووڕەوشتی سروشتی ئادەمیزاد.

**فەیز** "فیض": ئاوی زۆر، لافاو، شتی زۆر، دیاری زۆر، بەهرە.

**فەییاز** "فیاض": (١) ئاودار، سەرچاوەی پڕ لە ئاو، (٢) جەوانمەرد، کەسێ چاوتێر و سەخی تەبیعەت.

**فرزەند** "فرزند": منداڵ، کوڕ یا کچی پیاو و ژنێك کە لەم و لەوبێ.

**فەرید** "فرید": یەکتا، تەنیا، بێ هاوتا، بێ وێنە، گەوهەری یەکتا و بەنرخ، گەوهەرێك کە لەناو گەردنبەند و ملوانکەدا جێی بکەنەوە.

**فەلەك** "فلك": چەرخ، گەردوون، مەداری ئەستێرەکان، ئاسمان.

**فەلە گول ئەعزەم "فلك الاعظم"**: ئاسمانی گەورە.

**فینجان:** قاپێکی بچووك لە چینی یا بللور دروست دەکرێ بۆ خواردنەوەی چایی یا قـاوە بەکاردەهێنرێ.

**فەزلە "فضلة"**: پاشماوە، پاشماوەی شتێك، پاشمـاوەی تـەعام و خواردەمـەنی (٢) سـەر نویلك، سەرگین.

**فوزەلا "فضلاء"**: زانایان، دانیشمەندان، هونەرمەندان.

**فەوات "فوات"**: مردن، مەرگ، نەمان، نەبوون، تێپەڕبوونی وەختـی کارێـك، ڕابردنـی وەختی کارێك، فرسەت، دەرفەت.

**فەوج:** دەستەدەستە، پۆل پۆل، گرۆ گرۆ.

**فیلواقیعە "في الواقعة"**: لە ڕاستیدا.

**فیوزات "فیوضات"**: کۆی "فیض=فەیزە": بڕوانە فەیز.

**ق ـ**

**قاسی "قاصی"**: دوور، دووربوو، دووربووەوە، دژی دانی.

**قامەت "قامت"**: بالآ، قەد، بەژن، ئەنـدام، بلّنـدی لەشـی ئـادەمیزاد (٢) تـەکبیر و شەهادە و هەموو ئەو وشە و تەعبیرانەی کە لەپاش بانگی نوێژکردن و سـەرەتای نوێـژدا دەوترێن.

**قافلە "قافله"**: قافلّ: کاروان، کۆمەلّێك خەلّك کە بە یەکـەوە سـەفەر بکـەن، قافلّـە سالار، سەرقافلّە، سەرۆکی کاروان.

**قاپی:** دەرگا، بارگا.

**قەسوەت "قسوت"**: سەختی، ڕەقی، دلّ ڕەق بوون، بەزەیی نەهاتنەوە.

**قوتب** "قطب": (١) وەلی، شێخ، پیر، سەرۆکی میلەت (٢) لە زاراوەی جوگرافیادا هەر یەکێك لە دوولاکەی میحوەری زەوی کە قوتبی باکور و قوتبی جنوبی پێ دەڵێن (٣) ناوی ئەستێرەیەکە لەنێوان جەدی و فەرقەداندایە و ڕابەری قەبیلەیە.

**قورب** "قرب": نزیك، نزیکی، دژی دووری.

**قوللاب** "قلاب": چەنگاڵ، ئالەتێکی مەعدەنی سەر چەماوەیە بۆ ماسی گرتن بەکاردەهێنرێ.

**قودسی** "قدسی": نیسبەتە بۆ قودس، ناوی ئیسلامی ئۆرشەلیمە، بەهەشتی، پاك و پیرۆز، **قودسیان**: کۆی قودسی، فریشتەکان، دروستکاران، ڕاستان.

**قومری**: باڵندەیەکە لە کۆتر بچووکترە، بە جووتە لەگەڵ یەکتریدا دەژین، گۆشتی زۆر خۆشە.

**قوت**: (١) خواردن، خواردەمەنی ئەو شتەی کە ئادەمیزاد دەیخوات، (٢) تاك.

**قیدەم** "قدم": پێشینە، کۆن، دێرینە، پێشینە لە کارێکدا، دژی "حدوس- حدوث".

**قیاس**: ئەندازەگرتن، بەرامبەرکردنی شتێك لەگەڵ شتێکی دیکە، کە وەك یەك بچن، بەراوردکردنی دوو شت لەگەڵ یەکتر (٢) گومان.

**قەناعەت** "قناعت": ڕازیبوون بە بەش، ڕازیبوون بە کەم، بۆ وێنە دەڵێن فلان کەس قەناعەت دەکات، واتە بە بەشی خۆی قانع و دڵخۆش و ڕازییە.

**قەمەر** "قمر": مانگ، ڕووی مانگ.

**قورعە** "قرعە": بەش، بەهرە، نەسیب، بەخت، پارچەیەك کاغەز یا ئێسك کە فاڵی پێ دەگرنەوە و بەش و بەهرەی کە سێکی پێ دیاری دەکەن.

**قەید** "قید": (١) بەند، حەبس، زینـدانیکردن، (٢) ئـەو پەتـەی کـە دەسـت و پێـی ئینسان یا حەیوانی پێ دەبەستن (٣) شەرت و پەیمان (٤) ئەو داغەی بە ملی وشـتریەوە دەنێن، (٥) بەش و ئەندازە، (٦) جۆرە ئاڵەتێکی دار، ئەو ئاڵەتەیـە کـە سـەححافەکان دوای پەراوێز لێ نانی کتێب، کتێبەکەی تێدا ڕادەگرن.

**قەریب** "قریب": نزیك، نێزیك.

**قەعر** "قعر": بن، قوڵایی.

**قازی لاری:** ناوی موسلیحەدین لاری یە، خەڵکی ناوچەی لارستانە و پـەراوێزی لەسـەر زۆر کتێبی عیلمی (دینی) هەیە.

**ك ـ**

**کامیل** "کامل": تەواو، بێ کەم و کەسری، خووڕەوشتی تەواو.

**کاکۆڵ:** مووی سەر، دەستەمووێکە لەسەر کە بەسەر نێوچاواندا شۆڕدەبێتەوە.

**کاڵا:** جلوبەرگ، کەلوپەل، کوتاڵی بازرگانی، ماڵ و سامان.

**کەعبە** "کعبە": کابە، خانوویەکی چوارگۆشەیە لە ناوەڕاستی شاری مەککـە، بـەردی ڕەش "حجر الاسود" لە یەکێك لە سوچەکانیەتی، لە سەردەمی جاهلیدا بوتخانـەی بتـە گەورەکانی عەرەب لات و عوززا و مەنات و هوبـەل بوو، بیری زەمزەم لـە نزیکییـەوەیـە، حەزرەتی موحەممەد پەیامبەری بوتەکانی لـەناوبرد و کـردی بـە قیبلـەی موسـوڵمانان، ماڵی خوداشی پێ دەڵێن، ئەم ناوە بۆ سەردەمی جاهلی و پاش ئیسلامیش دەشێ.

**کەلب** "کلب": سەگ، کەلبی موعەللەم: سەگی فێرکراو سەگی پەروەردەکراو، سـەگی دەرس دادراو، سەگی ڕاهێنراو.

کەماڵ "کمال": تەواو بوو، کامل بوو، بێکەموکوڕی، خووڕەوشتی تەواو، عەقڵ ژیری.

**کەریمان:** جوامێران، گەورەکان.

**کەس** "کاس": پیاڵە، جام، کاسە، پیاڵەیەك کە ئاو یا شەرابی تێدا دەخۆنەوە. "کەئسولکەرەم" "کأس الکرم" کاسەی کەریمان، پیاڵەی گەورەکان، جام و پیاڵەی ئەو کەسانەی گەورە و خاوەن کەرەم و بەخشندەن.

**کەلیم** "کلیم": هاوقسە، هاوسوحبەت، "کەلیوللا =کلیم الله": نازناوی حەزرەتی موسایە، کەلیمی: پەیڕەوی حەزرەتی موسا، یەهودی.

**کولبە** "کلبە": کوخ، خانووی هەژاران، خانووی بچووك، خانووی گوند و ئاوایی.

**کینایەت** "کنایە": وشەیەکە لە جێی مانای ڕاستی خۆی بەکاردەهێنرێ، بەڵکو بۆ مانا و مەبەستێکی دیکە بەکاردەهێنرێ.

**کۆنگرە:** کۆڕ، ئەنجوومەن، کۆڕێك کە لە نوێنەرانی چەند دەوڵەت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی پێك بێ، کۆڕی زانایان و شارەزایان و هونەرمەندان بۆ باس و وتوێژکردنی مەبەستەکانی زانستی.

**کەشمەکەش:** کێشەکێش، تێکهەڵچوون، بەیەکداچوون، گێرە و کێشە، تەنگ و چەڵەمە، بگرەوبەردە، گفتوگۆ و ئاژاوە، دوژمنایەتی و ناخۆشی.

**کوفار** "کفار": کۆی کافر، خوانەناس، بێ ئیمان، بێ باوەر، نا سوپاس.

**کیفایەت** "کفایت": بەس کردن، بەس بوون، کافی بوون (٢) لێهاتووی.

**کەنعان:** ناوی جێگە و ئەو عەشیرەتەیە کە یەعقوب سەرۆکیان بووە، ناوی کۆنی فەلەستین، یا "ئەرزی مەوعود" "بەڵێنی پێدراو".

**کەففی خەزیب** "کف الخضیب": دەستی بەخەنە سووركراو،بەری دەستی خوێناوی. (٢) چەند ئەستێرەیەكی بچووك و بەیەكەوە نووساون كە شێوە دەستێكی لە خەنەدراو نیشان دەدەن.

**كۆ**: كوچە، كۆلان،گەڕەك، ڕێی باریكی ناوشار و ئاوایی.

**كلیلە**: بەستراو.

## گ ـ

**گوڵنار**: گوڵی هەنار، گوڵی سوور، گوڵی لە ڕەنگی ئاگر.

**گوڵخەن**: ئاتەشخانە ، ئاتەشخانەی گەرماو، تونی حەمام.

**گلاو**: پیس بوون، پیس بوون لە ئەنجامی لەش بە لەشی سەگ یا بەراز بكەوێ.

**گریبان**: بەرۆك، یەخە، گەنج: خەزێنەی زێڕ و زیو و جەواهیرات و بەردی بەنرخی شاراوە لە جێگەیەكی نهێنیدا.

**گردین**: "هەورامی": هەموو، تێكڕایی.

**گوسەستە**: لێك هەڵوەشاو، لێكهەڵپچڕاو، لێك جودا بووە.

**گیج**: "هەورامی": گێژ، گێژاو.

## ل ـ

**لالە**: (١) گوڵاڵە سوورە، گوڵێكی نیسان، گیایێكی بچووكە كە بە زۆری لە جێگەی تەڕ و ناوشاخ و قەراخ ئاو دەڕوێ، كێوی ماڵی هەیە، هەروەها لە ڕووی ڕەنگ و ژمارەی پەڕیەوە جۆری زۆرە، كێویەكەی ڕەنگی سوورە لەژێر پەڕەكاندا لە ككەیێكی ڕەش هەیە. (٢) جۆرە چرادانێكی بەللوورییە مۆمی لەناودا دەنرێ، لالە ڕووخان: لالەڕووان لاڵە ڕووخساران.

**لائیق** "لائق": شایان، لێوەشاوە.

**لاف و گەزاف:** خۆهەڵکێشان، قسەکردنی بێ مانا، داواکردنی زیاد لە ڕاستی.

**لەعلی** بەدەخشان: یەکێکە لە بەردە بەنرخەکان و ڕەنگی سوورە وەکو یاقوت، چەشنە ئۆکسیدێکی ئالۆمینی ڕەنگاوڕەنگە لە تەبیعەت پەیدا دەبێ، جوانترینی لەعلی بەدەخشانە، لەعلی بەدەخشان: کینایەتە بۆ لێوی سوور، دەمی یار، شەرابی سوور، مەیی ڕەگ سوور.

**لەفف و نەشر** "لف و نشر": (١) پێچانەوە و بڵاوکردنەوە (٢) لە زاراوەی زانستی "ئەدەب"دا ئەوەیە کە شاعیر چەند وشەیەك یا چەند ناوێك لە دێرە شیعرێکدا بهێنێ، لە دێڕە شیعری داهاتوودا سیفەت بۆ ئەو وشانە بهێنێ، بەو واژە و ناوانە دەڵێن "لەفف" وە بە سیفەت بەراوردەکانیشی دەڵێن "نەشر" لەفف و نەشر سێ جۆرە، ١- لەفف و نەشری مورەتتەب: واتە واژەی یەکەمی نەشر پەیوەندی بە واژەی یەکەمی لەففەوە دەبێ، دووەم بە دووەم و سێیەم بە سێیەم، تا دوایی. ٢- لەفف و نەشری مەعکوس: واتە وشەی یەکەمی نەشر پەیوەندی بەواژەی دوایی لەففەوە دەبێ. ٣- لەفف و نەشری موشە و وەش: ئەوەیە کە تەرتیب و دەستووری تایبەتی و دیاری کراوی نییە.

**لەیلا** "لیلی": کچی مەهدی عامیرییە، ناوی ژنێکی عەرەب بووە. بەڵام باوکی ویستوویەتی بیدات بە کابرایەك ناوی ئیبن سەلام بووە، بەڵام لەیلا شووی پێ نەکردووە و لە داخی دڵداری مەجنون مردووە لەپاش ئەو مەجنونیش کۆچی دوایی کردووە نیزامی گەنجەوی شاعیری بڵند پایە لە چیرۆکی شیعری "لەیلا و مەجنون" ئەو ڕووداوانەی کردووە بە ئەدەب و هونەرێکی یەکجار بەرز و نایاب.

**لەیل و نەهار** "لیل ونهار": ئەو ڕۆژ.

**لەتیف** "لطیف": نەرم، ناسك، جوان، دڵسۆز، میهرەبان، خووڕەوشتی چاك.

**لیقا** "لقا": وشەیەکە تێکەڵاو لە لەوولا=لوولا": واتە ئەگەر نا، "لەولاك. لولاك": واتە ئەگەر تۆ نەبای ، ئیشارە بە حەدیسی بەناوبانگی: "لولاك لما خلقت الافلاك": کە ڕووی قسەی لەگەڵ پێغەمبەری ئیسلامە، واتە ئەگەر تۆ نەبای ئاسمانەکانم دروست نەدەکرد.

**لوئالی** "لئالی": کۆی "لوئلؤ=لؤلو": دوڕ، مرواری.

**لەهجە** "لهجە": زبان، زبان وشەیەك کە ئینسان قسەی پێ دەکات، شێوەی قسەکردن.

**م -**

**ماهی تابان:** مانگی تریفەدار، مانگی درەوشەدار، مانگی ڕووناك.

**ماتەم** "ماتم": پرسە، تازیە.

**مائی فورات** "ماء فرات": ئاوی ڕووباری "فورات".

**مایيل** "مائل": ئەوەی ئارەزووی شتێك دەکات، ئەوەی بە شوێن شتێکدا دەگەڕێ، لایەنگر.

**مەجبور**"مجبور": ناچار، بێچارە، ئەو کەسەی کاری بە دەست خۆی نەبێ، ئەو کەسەی بەزۆر کارێکی پێ بکرێ.

**مەئوا** "ماوا=ماوی": جێگە، پەناگا، ماڵ، هێلانە.

**مەتاع** "متاع": کاڵا، سامان، هەموو شتێکی سوودی هەبێ، زێڕ و زیو.

**مەئیوس** "مایوس": ناهومێد، بێ هیوا، بێ ئامانج، دڵسارد، دەست شوشتن لە شتێك.

**مەحروم** "محروم": نا هومێد، بێ بەش، بێ بەهرە، دوور لە هەموو خێر و خۆشییەك.

**مەحرەم** "محرم": کەسوکاری نزیك، ئەندامانی بنەماڵە، ئەوانەی نابێ شوکردن لەنێوانیاندا ببێ.

**موحەررەم "محرم"**: مـانگی یەکـەم لـە سـاڵی کۆچـی مـانگی، "شـهر الحـرام و محـرم الحرام"یشی پێ دەڵێن، ئەو مانگە بۆیە پێی دەڵێن موحەررەم چونکە عەرەبەکان شەڕیان لەو مانگەدا بە حەرام زانیوە.

**مەسلەك "مسلك"**: ڕێ، ڕێباز، ڕێگە، ڕەوشت، تەریقەت.

**مەشکور "مشكور"**: ئەو کەسەی سوپاس دەکرێ، ئەو کەسەی کار و کردەوەی پەسـند دەکرێ، سوپاس و وتن.

**مەسرور "مسرور"**: شادمان، شاد، خۆشحاڵ، دڵخۆش.

**موبەررا "مبری"**: ئەو کەسەی لە تاوان پاك و بە دوورە، ئەو کەسەیە کـە لـە دواییـدا ئاشکرا دەبێ کە تاوانی نەکردووە.

**مەرجان**: بەردێکی سووری مەیلە و پەمەیی بەنرخـە لـە جـۆرە جانـەوەرێکی دەریـایی دەردەهێنرێ، ئەو جانەوەرە لە گیا دەکا، هەر وەکو ئەویش لە زەوی بن دەریا چەسپاوە، لە کۆندا وایان دەزانی کە یەکێکە لە گیاکـانی دەریـا، جـۆرێکی مـەرجان لـە زەرنگەیـدا بەکاردەهێنرێ بۆ دروستکردنی خشڵ و شتی دیکەی هونەری بەنرخ.

**مەجنون "مجنون"**: (١) قەیسی عامری، خەڵکی نەجد بووە، لە ڕاستیدا شێت نـەبووە، بەڵکو پلەی دڵداری و خۆشەویستی بەرامبەر لەیلا وای لێکردووە، لەگەڵ لەیلادا ئامۆزا بوون، بەڵام کە ویستی لەیلا بخوازێ باوکی نەیدایە، سەری خـۆی هـەڵگرت و ڕۆیـی بـۆ بیابانەکانی شام و نەجد و حیجاز و کەوتە شیعر وتن، لەگەڵ کێـوی یـادان دەبینـرا تـا ڕۆژێك بە مردوویی لەناو کۆمەڵە بەردێك دۆزرایەوە، ئەسمەعی دەڵـێ مـەجنون نـەبووە، جاحیزیش دەڵێ هەر شاعیرێکی نەناسراو شیعرێکی وتبێ و ناوی لـەیلای تێـدا بووبـێ، خراوەتە پاڵ مەجنون، گوایا لـە سـاڵی ٦٨٨ زایینیـدا مـردووە، (٢) شـێت، سەرچـڵ، دێوانە.

**موجەرڕەد** "مجرد": (١) ڕووت، بێ جلوبەرگ، تاك و تەنیا پیاوی بێ ژن (٢) لە زاراوەی زانستی حیکمەتدا ئەوەیە کە دوور بێ لە ماددە وەکو بیروگیان.

**موتلەق**"مطلق": (١) ئازاد، ڕزگار، (٢) ئەڵبەت، دیارە، دەبێ، بە هەموو جۆرێ.

**موتریب** "مطرب": گۆرانیبێژ، مۆسیقاژەن، سەماکەر.

**میهر** "مهر": (١) دڵسۆزی، خۆشەویستی، دۆستی، (٢) ڕۆژ، خۆر، هەتاو، (٣) لەپێش زەردەشتدا ناوی یەکێك لە خوداکان بووە کە لە ڕۆژدا خۆی نوواندووە، (٤) مانگی حەوتەمی ساڵی هیجری خورشیدی ئێرانییە، مانگی یەکەمی پاییزە، (٥) ناوی ڕۆژی شازدەهەمی هەموو مانگێکی خورشیدییە (٦) جەژنێکە لە کۆندا لە ڕۆژی شازدەهەمی مانگی میهر بووە، میهرەگانیان پێ وتووە، (٧) ناوی کچە.

**موبارەك** "مبارك": پیرۆز، بەپیت و بەرەکەت.

**موسحەف** "مسحف": قورئان ئەو کتێبە پیرۆزە ئاسمانییەی کە بۆ حەزرەتی موحەممەد بە دیاری هات.

**مەجزوب** "مجذوب": ڕاکێشراو، ئەو کەسەی سەوداسەر و شەیدای عیشق بووە.

**ماعاریف** "معارف": (١) زانستی، زانستییەکان، زانیاری (٢) خەڵکی ناسراو، زانا و شارەزا، نزیك و ناسیاوی.

**مەرحەمەت** "مرحمت": میهرەبانی، بەزەیی پێداهاتن لوتف و ڕەحمەت.

**مەحەببەت** "محبت": خۆشەویستی، دۆستی.

**مەشعەلە** "مشعل=مشعله": ئاگری تێدا دەکرێتەوە. چرادان، قەندیل، شاپلێتە.

**مەشرەب** "مشرب": (١) زەوق، مەیل، خەیاڵ، هەوای نەفس، شێوەی بیرکردنەوە، (٢) جێی ئاو خواردنەوە.

**مەجمەعە** "مجمعە":ئۆردوگا، زەمینێك كە خەڵك لەوێدا كۆببنەوە، بیابانی بێ ئاو و گیا، مەجموعە، سینی گەورە.

**مەجموع** "مجموع": كۆكراوە، دەفتەرێك كە بە مەبەستی جۆراوجۆری تێدا كۆكرابێتەوە، وەكو شیعر و نووسراوی دیكە.

**مەجمەر** "مجمر": بخوردان، (٢) ئاگردان، ئەو شتەی ئاگری تێدا دەكرێتەوە.

**موشتاق** "مشتاق": ئارەزوو، ئارەزومەند، تاسەخواز، ئەوەی مەیل و ئارەزووی شتێك دەكات، خاوەن شەوق و ئارەزوو.

موشتەق "مشتق": جیابوونەوە، شتێك لە شتێكی دیكە جودا بووبێتەوە، وشەیەك لە وشەیەكی دیكەی وەرگیرابێ و دروستكرابێ.

**موشەووەش** "مشوش": شێواو، پەشێو، پەرێشان، تاریك.

**مەسئەلەت** "مسئلە. مسالە": داواكردن، ویستن، تكا كردن.

**مەتلەع** "مطلع": (١) پێشەكی، سەرەتای قسە، یەكەمین دێڕی غەزەل یا قەسیدە (٢) ئەو جێ و لایەی كە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەكانی لێ هەڵدێ.

**مونتەخەب** "منتخب": تایبەتی هەڵبژێرراو، نوێشك.

**مەعریفەت** "معرفت": ناسینی شتێك، زانستە زانیاری (مەعریەتوللا=معرفت اللە": خواناسی.

**مەعشوق** "معشوق": یار، خۆشەویست، دڵبەر.

**مەعدوم** "معدوم": لەناوچوو، تیاچوو، نەبوون، نەبوو.

مەنزور "منظور": ئەوەی دەكەوێتە بەرچاو، دیار، بیزراو، ئەوەی دەبیزرێ.

**مونتەزیر** "منتظر": ئاوەنۆڕ، چاوەڕوان، چاوەڕوانی.

**مەنزل** "منزل": خانوو، شوێنی دابەزین، شوێنێ.

**میعراج** "معراج": پەیژە، قاڵدرمە، پێپلکانە، ئەو شتەیە کە بە هۆی ئەوەوە ئادەمیزاد دەتوانێ بەرز ببێتەوە، شەوی میعراج: ئەو شەوەیە کە حەزرەتی موحەممەد بە فەرمانی خودا بەرز بووەوە بۆ لای بارەگای خودا و گەیشتە مەقامی ئەو، ئەو جێیەی کەس نەیگەیشتۆتێ.

**مەدینە** "المدينة": (۱) شارێکە لە حیجاز لە باکوری رۆژئاوای وڵاتی سعودیەی عەرەبی، لە خاکێکی پڕ لە ئاو و میوەدایە، لەپێشا ناوی "یەسریب=یثرب" بوو، حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری ئیسلام لە ٦٢٢ی زایینی هیجرەتی کردە ئەوێ و لە ٦٣٢ زایینی حەزرەتی رەسول (د-خ) لە مەدینە وەفاتی کرد و دوای ئەو زاتە، حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان بەدوای یەکدا بوونەتە خەلیفە و جێنشینی پێغەمبەر، مەقدی پێغەمبەر و سێ کەس لە خولەفای راشیدین: ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان (ر. ض) لە مەزار و مزگەوتی نەبی ئەکرەم لە مەدینەیە، لە ساڵی ٥١٧ زایینی مەدینە کەوتە بن دەس تورکی عوسمانی و لە ساڵی ١٩١٦ زاینی لە دەست عوسمانیەکان دەرچوو لە ١٩٢٤ی زایینی کەوتە بن دەستی عەرەبی سعودی.

**مەنتیق** "منطق": (۱) قسەکردن، وتار، تەرازووی قسە (۲) ناوی زانستێکە بە هۆی دەستووری ئەوەوە ئادەمیزاد دەتوانێ خۆی لە هەڵە بپارێزێ لە بیرکردنەوە یا لێکدانەوەدا، دەڵێن ئەرەستۆ دەستووری ئەم زانستەی دۆزیوەتەوە.

**مەدار** "مدار": جێی سووڕانەوە و بزووتنەوە، ئەو شتەیە کە شتێك لە چوار دەوریدا دەسووڕێتەوە، ئەو جێیەیە کە شتێك دەورەی دەدا، لە زاراوەی جوگرافیادا بریتییە لەو خەتەی کە ئەستێرە گەورەکان تێیدا بەدەوری رۆژدا دەسووڕێنەوە، دائیرەیەکی نا دیارە لەسەر رووی زەوی موازی خەتی ئیستوایە.

**مەستور** "مستور": (١) داپۆشراو، لەپشت پەردە (٢) داوێن پاك، بەناموس، بەحەيا (٣) ئەندامی مێینەی ژن.

**مەسموم** "مسموم": ژەهر خواردوو، كە سێك كە ژەهر بچێنە ناو لەشیەوە.

**مەبحەس** "مبحث": باس جێی لێكۆڵینەوە و گەڕان بەدوای شتێكدا.

**میسال** "مثال": كۆی "مەسەل=مثل"ە: وەكو سیفەت، قسەی نەستەقەت، قسەی داهێنراو.

**موعەتتەر** "معطر": عەتراوی، بۆنخۆش.

**مريد**: خاوەن ئیرادە، ئەوەی بڕیاردەدا لەسەر كردنی شتێك، ئەوەی ئارەزووی شتێك دەكا، ئەو كەسەی ببێ بە پەیڕەوی پیرێك و و شێوە و ڕەوشتی تەریقەتی دەروێشی بەكاردەهێنرێ (٢) یەكێك لە سیفەتەكان سبوتی خوای گەورەی.

**مەلەكوت** "ملكوت": گەورەیی، هێز و دەسەلاتی ئاسمانیی، دونیای فریشتەكان، مەلەكوتی: نیسبەتە بۆ مەلەكوت، واتە ئاسمانی مەلاییكەیی.

**مەلول** "ملول": پەشێو، خەمگین، شێواو، دڵتەنگ.

**ملكی وەحدەت** (ملكی وحدت": ملكی خواناسی، ملكی یەكتاپەرستی .

**مەرارەت** "مرارت": تاڵبوون، ڕەنج و سەختی، ناخۆشی.

**مەزاق** "مذاق": تام، چێژ، چەشتن، زەوق، جێگەی هێزی چەشتن، ژێر زبان.

**مورشید** "مرشد": ڕێنما، ڕێبەر، ئەو كەسەی ڕێی ڕاست بە خەڵك نیشان دەدا.

**مەكتەب** "مكتب": جێی نووسین، جێی دەرس وتنەوە، فێرگە، مەدرەسە.

**مینا**: شیشە، بەللور، ئاوێنە، نەینوك (٢) هەموو شتێكی بەلاجیوەرد و زێر و زیو و بەردی بەنرخ نەخشكراو بێ (٣) جۆرە ڕەنگێكە بەكاردەهێنرێ، (٤) میناتور،

وێنەکێشان، نەخشکردن بەلاجیوەرد و زێڕ و زیو و ڕەنگ لەسەر ڕووی کاغەز یا مەعدەن (٥) پێستی سپی سەرددان (٦) ناوی باڵندەیەکە، (٧) گوڵێکی جوانە ناوەڕاستی خڕ و زەردەپەڕی سپی یا شینی کاڵی بوتەوە (٧) جێیەکە لە شاری مەککە و ڕەببانی لێ دەکرێ، ئەو قوربانییەی لەوێ دەکرێ، "نەحری مینا"ی پێ دەڵێن.

**مەهیب** "مهیب": سامناك، بەهەیبەت، کەسێك یا شتێك کە ئادەمیزاد لێی بترسێ.

**مەهلەکە** "مهلکە": جێی لەناوچوون، جێی قەلاچۆبوون، مەیدانی جەنگ کە خەڵکی تێدا دەکوژرێ.

**مەنشەء** "منشاء": سەرچاوە، شوێنی پەیدابوون، شوێنی دیاربوون، جێگەی نەشونما و پەروەردەبوون.

**مرووەت** "مروت": پیاوەتی جوامێری، جەوانمەردی، مەردانەیی، دڵ ناسکی.

**مەنسور** "منصور": یارمەتی دراو، یاریدەدراو، سەرکەوتوو.

**موخلیس** "مخلص": دۆستی پاك، دۆستی بێ ڕیا و بێ خەوش ئەو کەسەی کاری بێ ڕیا دەگەیەنێتە ئەنجام.

**مەحشور** " محشور": هاوڕێ، هاودەم، هاونشین، هاوسوحبەت لە دەوری یەك کووبوو.

**مەحز** "محض": خالیس، پاك، هەر شتێکی خالیس کە لەگەڵ شتێکی دیکە تێکەڵاو نەکرابێ.

**موحەسیل** "محصل": بەدەستهێنەر، ئەو کەسەی شتێك بەدەس بێنێ، تەحسیل دار، مەئموری وەسول، قوتابی شاگردی مەدرسە.

**مەسحور** "مسحور": سیحر لێکراو، جادولێکراو، فریودراو.

**میزاج**: تێکەڵبوون، تێکەڵاوبوون، ئەوەی کە شتێکی لەگەڵ بوو بێ، وەکو شیر یا شەراب لەگەڵ ئاو (٢) سرشت، خووڕەوشت تەبیعەت، حاڵەتی سروشتی بەدەن.

**مولاقات** "ملاقات": لەگەڵ کەسێك ڕووبەڕوون، ڕووبەڕووبوون لەگەڵ یەکتر، یەکتردیتن.

**موحیببان** "محبان": دۆستان، خۆشەویستان.

**موشتەری** "مشتری": (١) کڕیار، ئەو کەسە کە شتێك دەکرێ، (٢) ئەستێرەی گەرۆکی بەرجیس، ئەستێرەی هورمز، گەورەترین ئەستێرە گەڕۆکەکانی بنەماڵەی ڕۆژە، لە ڕووی ڕوانکێشەوە لە دوای زوهرە دووەمین ئەستێرەیە نزیك بە ١٢٣٠ بەرامبەری زەوییە و دوازدە مانگی هەیە و هەر دوازدە ساڵ یەك دەور بە دەوری خۆردا دەگەڕێ، قازی فەلەکیشی پێ دەڵێن.

**موشك:** ماددەیەکی بۆنخۆشە لە ناوکی مامزی موشك دێتە دەرێ، مامزی موشك جۆرە ئاسکێکە دوکەڵی درێژی هەیە وەکو نابی فیل، زۆرتر لە شاخەکانی هێمالیای هێندستان دەژی، لەژێر زگی کیسەیەکی بچووکی وەکو دومەڵ هەیە ماددەیەکی پەیتی تێدا کۆدەبێتەوە هەر کاتێك کە کیسەکەی پڕ دەبێ مامز کە هەست بە ئازار و خارشت دەکا، ناچار لە بەردی دەخشێنێ تا دومەڵەکە دەتەقێ و ئاوی پۆرگەکە دەرژێتە سەر ڕووی زەوی وشك دەبێتەوە، ئەمە ماددەی موشکی بۆنخۆشە، مامزی تا تار و مامزی خەتا و مامزی موشکینیشی پێ دەڵێن.

**موفلیس** "مفلس": هەژار، بێچارە، بێ شت، بێ ماڵ و سامان، بێ پوڵ، دەستکورت.

**مودارا** "مدارات=مدارا": ڕەفتارکردن لەگەڵ کەسێك بەر و خۆشی و میهرەبانی، ڕووی خۆش نیشاندان بە کەسێك.

**موهر** "مهر": (١) مۆر، ئالەتێکی مەعدەنی یا پلاستیکییە ناوی کەسی لەسەر هەڵدەکەندرێ، لە باتی ئیمزا لە نامە و پاکەت و شتی دیکەدا چاپ دەکرێ، یا شتێك دادەخرێ بۆ ئەوەی نەکرێتەوە مۆری لێ دەدرێ، (٢) کیسەی سەربەستراو، کیسە ناکراوە.

**مونـافی** "منـافی": پێـچەوانە، پێـچەوانەی یـەکتربوون، یـەکتر دەرکـردن و یـەکتر دوورخستنەوە.

**موحابا** "محاباە": لایەنگرتن، یاریدەدان، لایەنگرتنی کەسێك بەبێ هەق.

**موددەعی** "مدعی": ئەو کەسەیە کە داوای لای یـەکێکی دیکـە هەیـە، ئـەو کەسـەی داوای هەقی خۆی دەکات.

**موئمین** "مؤمن": بە ئیمان، موسوڵمان، پێچەوانەی کافر.

**مەئمول** "مامول": ئارەزووکراو، ئاواتەخواز، تاسەبار.

**موجاز** "مجاز": ئیجازەدراو، خاوەن ئیجازە، ئیزندراو، ڕەوا.

**موددەعا** "مدعا": بانککراو، داواکراو، ئارەزوو.

**موعتاد** "معتاد": خووگرتوو، ئەو کەسەی بە کارێك یا بە شتێك خوو بگرێ.

**مولا** "منولا": خاوەن، گەورە، سەروەر، ئاغا، خۆشەویست.

**مەوزون** "موزون": کێشراو، ئەوەی قورسایی هەیـە، ئـەوەی قاڵـب و ئەنـدازەی خـۆی گرتووە.

**مول** "مل": شەراب، مەی.

**مونیس** "منس": هاودەم، هاونشین، خوو پێ گرتوو.

**مونکیر** "منکر": بێ باوەر، ئەو کەسەی باوەڕی بە کارێك یا شتێك نەبێ.

**میقدار** "مقدار": ئەندازە، پارچەیەك لە شتێك، ئەوەی بە هۆی ئەو ئەندازەی شتێك بە دەست بێ.

**مەنسور** "منشور": پرژاو، پەرت و بلاو، پڕاکەندە، (٢) پەخشان، نەسر.

**مەهوەش:** جوان، دلّبەر، مانگ ڕووخسار، مەهوەشان، ئەو کەسانەی ڕووخساریان وەکو مانگ جوانە، ڕوویان دەڵێی مانگە.

**موددەببیر** "مدبر": ڕاوێژکەر، ئەوکەسەی بیری پاشەڕۆژی هەیە، ئەوەی پاشەڕۆژی لە بەرچاوە.

**مونحەسیر** "منحصر": ڕاوەستاو لەسەر شتێك.

مەفقود "مفقود": گوم بوو، ونبوو.

**مەبدەء** "مبدأ": سەرەتا، بنەڕەت، ئەسڵ، هۆ.

**مەتبوع** "متبوع": پەیڕەوکراو.

**مەحفوز** "محفوظ": پارێزراو، ڕاگیراو.

**موعین** "معین": یاریدەدەر، یارمەتیدەر، یاوەر، یار.

**مەنع** "منع": ڕاگرتن، وەستاندن، وەستاندنی کەسێك لە کارێك یا شتێك.

**مەنزڵ:** خانوو جێگەی دانیشتن و ژیان، سەرا.

**مەزڵوم** "مظلوم": ستەملێکراو، ستەم دیتو، ئەو کەسەی زوڵم و ستەمی لێ کرابێ.

**مەعاسی** "معاصی": کۆی "مەعسییەت=معصیت": گوناه، تاوان.

**مومتاز:** هەڵبژێردراو، تایبەتی، جوداکراوە.

**مەجاز** "مجاز": وشەیەك لە جێی ڕاستەقینەی خۆی بەکار نەهێنرێ و بۆ مانایەکی دیکە وەربگرێ بە مەرجێك پێوەندییەك بە مانا بنچینەییەکە بیان بەستێتەوە.

**موشکیل** "مشکل=مشکله": کاری سەخت، کاری قورس.

**موژگان:** مژوڵ، بژانگ، برژانگ.

**میرئات** "مرآه": ئاوێنە، نەینوك.

**موهەییا** "مهیا": ئامادە، حازر.

**مەئسور** "ماپور": قسەوباس، قسەوباسێك كە لە كۆنەوە لە یەكێكەوە بە یەكێكی دیكە گەیشتبێ.

**مەلاحەت** "ملاحت": دڵبەری، جوانی، پڕ خۆی بون.

**مەزبەلە** "مزبلە": زبڵخانە، جێی ڕشتنی زبڵ.

**میحنەت** "محنت": ئازار، ئاوەدان، تەعمیركراو، دژی كاولا و كەلاوە.

**مەخزەن** "مخزن": گەنجینە، عەممار، جێی پاراستنی ماڵ، فێڵباز، پڕمەكر، جادوگەر.

**مەسدود** "مسدو": بەستە، بەستراو، داخراو.

**مەیت** "میت": مردوو.

**مەسرەف** "مصرف": خەرجكردن.

**موئەددیب** "مؤدب": خاوەن تەربیەت، بەئەدەب.

**مەخجول** "مخجول": شەرمەزار، خەجاڵەتی پیماو.

**مەزبوت** " مضبوط": وەرگیراو.

**مەكتەبی روشدییە:** ئیبنی روشد ئەبولوەلید "٥٠٢-٥٩٥"ی كۆچی مانگی فەیلەسوفی بەناوبانگی عەرەب كە دانیشتوی ئیسپانیا بووە و خەڵكی "قەرتەبە"یە، نزیك بە پەنجا جلد كتێبی نوسیوە كە یەكێك لەو كتێبانە فەلسەفەی ئیبنی روشدە، ئەلكوللیاتی ئەو لە زانستی پزیشكیدا بە زمانەكانی لاتین و ئیسپانیایی و عیبری تەرجەمە كراوە، لە وڵاتی مەراكیش كۆچی دوایی كردووە و لە شاری "قەرتەبە" بەخاك سپێردراوە.

**ن -**

**نار:** ئاگر.

**نافه:** وەکو ناوك، ناوك ئاسا، وێنەی ناف، ناوکی مامزی موشك، ناتیق "ناگۆ": ڕەوانبێژ، قسەزان، چاودێر، قسەڕەوان دەمەوەر، فەسیح.

**ناقیس** " ناقص": هەر شتێك کە کەم و کەسری تێدا بێ.

**ناگەهان:** لەناکاو، لەپڕدا، سەرزدە، بێ خەبەر، بێ وەخت.

**نایب** "نائب": جێنشین جێگر، کەسێکە لە باتی یەکێکی دیکە کاروبار دەگەیەنێتە ئەنجام.

**نەباتات** "نباتات": کۆی نەبات=نبات: گیا، هەموو شتێکی کە لە سەرزەوی بڕوێ، وەکو گوڵ و دار و درەخت.

**نەزم** "نظم": (١) شیعر، قسەی کێش و قافیەدار، دژی پەخشان (٢) ڕێکوپێك کردن، جوانکردن، بە ڕستەوە کردنی مرواری.

**نەزارەت** "نظارت": بینین، ڕوانین، چاوەڕوانی، چاوەدێری، چاو لە ڕێ بوون، (٢) زیرەکی و وریایی.

**نەشر** "نشر": (١) بڵاوکردنەوە، بڵاوکردنەوەی دەنگوباس (٢) هەڵخستنی جلوبەرگ و پارچەی شۆراو، (٣) زیندووکردنەوە، زیندووکردنەوەی مردوومان لە ڕۆژی قیامەتدا، دژی لەفف زاراوەیەکە لە شیعردا بەکاردەهێنرێ، بڕوانە "لەفف و نەشر".

نەسر "نثر": پەخشان، پەرگەندەکردن، قسە و وتەیەك شیعر نەبێ.

**نەفس** "نفس": گیان، لەش، جەوهەری هەموو شتێك، نەفسی ئەممارە: گیانی شەیتانی کە ئادەمیزاد فریو دەدا و هەڵی دەخەڵەتێنێ بۆ کاری خراپ و ناپەسەند.

**نەفەس** "نفس": با، هەناسە، ئەو بایەیە کە لە کاتی هەناسەکێشاندا لەنێوان سی و دەمدا دێ و دەچێ.

**نیسبەت** "نسبت": نزیکایەتی، پێوەندی لەنێوان دوو شت یا دوو کەس، لەیەکچوون لەنێوان دوو شت.

**نیسار** "نثار": پەراگەندەیی، پەرش و بڵاوی (٢) ئەو شتانەیە کە بەسەر بووك یا هەر کەسێکی دیکەدا دەکرێ لە سەردەمی خۆشی و بەختیاری دا، لە شیرینی و پارەو شتی دیکە.

**نەسیم**: سروە، شنەی شەماڵ، شنەی با.

**نەزیر** "نظیر": وەك یەك، بەرامبەر، هاوتا، وێنەی یەك.

**نیزام** "نظام": رێکوپێك کردن، ئاراستەکردن، رستەکردنی مرواری، رستەی مرواری، شێوە و رەوشت، ریزی دار و درەخت لە فارسیدا بە مانای سپا و ئەرتەش.

**نیزاع** "نزاع": شەڕ و کێشە، گفتوگۆ و کەشمەکەش، جەنگ.

**نەقش** "نقش": رەنگ رشتن، کێشانی وێنەو روخساری کەسێك یا شتێك.

**نوقسان** "نقصان": کەمێ، کەم بوون.

**نەقد** "نقد": هەڵاوەژێری، پاککردنەوە، جوداکردنەوەی پارەی ساغ لە قەڵب، دەرخستنی جوانی و ناشیرینی قسە و وتار و شیعر (٢) پارە، پۆل، نرخ، نەقدی عەیار.

**نوقتە** "نقطة": نیشانەیەکی بچووك و خڕە لەژێر یا لەسەر هەندێك پیتی نووسیندا هەیە، وەکو نوقتەی سەر پیتی (ن) یا ژێر پیتی (ب) خاڵ.

**نەمام**: گیا و داری تازە پێگەیشتوو، هەموو کەسێك و شتێکی تازە پێگەیشتوو.

**نیش**" (١) نووکی تیژ، وەکو دەرزی و خەنجەر و نەشتەر و هی دیکە (٢) چزوی هەندێ زیندەوەری وەکو دووپشك و زەردەواڵە و مار کە زەهریان بەهۆی ئەوەوە دەرژێننە ناو لەشی ئادەمیزاد.

**نەقایس** "نقائص": کۆی "نەقیسە=نقیصە": بڕوانە نوقسان "نقصان".

**نیسیان** "نسیان": فەرامۆشکردن، فەرامۆشی، لە بیرچوونەوە، لە یادچوونەوە.

**نوعمان** "نعمان": نازناوی هەر یەك لە فەرمانڕەوایان و پادشایانی حەیرە، (٢) بە مانای خوێن، "شقائق النعمان": گوڵ لالە، گوڵاڵە سوورە.

**نمەدپۆش:** ئەو کەسەی جلوبەرگی پینە و پەڕۆی دەرویشی دەپۆشێ.

**نیگار:** (١) بوت، خۆشەویست، مەعشوق، دڵبەر، مەحبوب، (٢) نەقش، وێنە.

**نیگاه:** ڕوانین، تەماشاکردن، چاو، ڕوونی کردن.

**نەوا:** (١) ئاهەنگ، ئاواز، (٢) ناوی ئاوازێکی تایبەتییە، (٣) ماڵ و سامان، هۆی زیندەگانی (٤) خواردەمەنی .

**نەدامەت** "ندامت": پەشیمانی، دڵگیری، خەم و خەفەت.

**نەحو** "نحو": (١) زانستێکە لە بابەت ئیعراب و دەستووری ڕاست خوێندن و دروست نووسینیٛ زمانی عەرەبییەوە، (٢) وەکو لا، ڕێگە.

**نەفیی** "نفی": دوورخستنەوە، نەبوکردن (٢) دەرکردن دوورخستنەوەی کەسێك لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە، ئاوارەکردن.

نیدا "ندا: بانگکردن، بانگ و ئاواز.

نەقیزەین "نقیضین": پێچەوانە، دژ و پێچەوانەی دوو شت، سەروژێری.

نمانا "هەورامی": نواندی، دەریخست، نیشانیدا.

**نەشوجەویرت** "هەورامی": لە یادت نەچێ، لە بیرت نەچێ، فەرامۆشی نەکەی.

**نیهایەت** "نهایت": دوایی، پایان، ئاخر، دوایی کارێك یا شتێك.

**نەوخیز:** تازە ڕوواو، تازەدەرهاتوو، تازە پێگەیشتوو.

## و

**واریس** "وارث": میراتگر، ئەوەی میرات دەبا، ئەو کەسەی میراتی بۆ دەمێنێتەوە لە یەکێکی دیکەوە.

**والا**: بالاّ بلّند، بەرز، پایە بلّند، (٢) جۆرە قوماشێکی ئاوریشمییە.

**واسیع** "واسع": فراوان، بەرین، دژی تەنگ.

**وەسف** "وصف": پێدا هەلّگوتن، دەرخستنی شێوەی شتێك یا کەسێك دەرخستنی وەزعی شت.

**وەسوەسە**: ئەندێشەی بەد پەیداکردن، بزووتنەوەی هەوا و هەوەسی شەیتانی لەناو دالّدا.

**وەسل** "وصل": پێوەندکردن، بەستن بەیەکترییەوە، بەیەکتری گەیشتن.

**وەنەوشە**: گیایەکی کورتە، قەدی باریك و گولّی بچووکی هەیە، ڕەنگی شین یا زەرد دەبێ، لە باخچەدا دەڕوێنرێ، لە تەبیعەتیشدا بەهاران لە وپێش هەموو گولّێك دا دەردەچێ، بۆنی خۆشە و گولاّوی لێ دەردەهێنرێ.

**وڕێنە**: هەزەیان، بێهودە وتن، لە حالّی نەخۆشی یا لە خەودا، قسە برزکاندن، وتاری بێهودە و نا عاقلاّنە لە حالّی نەخۆشیدا.

**وەعز** "وعظ": پەند و ئامۆژگاریدان، ئامۆژگاریکردن، ئاڕاستەکردن بۆ کاری چاك.

**وەعدە**: (١) پەیمان، بەلّێن، (٢) سەردەم، کات.

**وەعید** "وعید": بەلّێندانی شەڕوبەدی، وەعدەی خراپە ترساندن.

**وەزارەت** "وزارت": وەزیری، پلە و پایەی وەزیری.

**وەجد** "وجد": ئەوین و خۆشەویستی، زەوق، شەیدا و سەوداسەری کەسێك بوون، خۆشی، خۆشحالّی.

**وجووه**: کۆی "وجهه=وەجهە": ڕوو، ڕووخسار، ڕووی شتێك (٢) ڕێگـا، لایـەن، نییـەت، هۆ، (٣) گەورەی قەوم، (٤) کەسێکی پایە بەرز، (٥) پارەپوڵ.

**ویجدان** "وجدان": نەفس و هێزی با تینی نەفس، ئەو هێزە با تینییەی کە بـەهۆی ئـەو لە چاك و خراپی کردەوەکان تێ دەگەین.

**وجود**: (١) بوون، هەستی، پێچەوانەی عەدەم (٢) لەش، بەدەن، جەستە.

**ویرد** "ورد": زیکر، دوعا، کەمێك لە قورئان کە ئینسان هەموو شەو ڕۆژێ بیخوێنێ.

**ویسعەت** "وسعت": گوشادی، هەراوی، بەربلاوی جێ پانایی.

**وێڵداش**: هاوڕێ، دۆست، ڕەفیق، هاواڵ، وشەیەکی تورکییە.

**وەحید** "وحید": تەنیا، یەکتا.

ه=

**هاتیف** "هاتف": دەنگی غەیبی، ئاوازی غەیبی، دەنگ و سەدای غەیبی.

**هیجران** "هجران": جودایی، دووری لە دۆست و یاران.

**هیلال** "هلال": مانگی سەرەتای مانگ تا سی شەو، کە بە شێوەی کەوان لـە ئاسمانـدا خۆی دەنوێنێ، کینایەتە بۆ برۆی دلبەر و لاوازی دلدارو عاشق.

**هەراس** "هراس": ترس و بیم.

**هەم جالیس**: هاونشین، دۆست، هاوڕێ، ڕەفیق.

**هیممەت** "همت": بڕیار و کۆششی بەهێز، مەبەست، توانا،

**هەینەت "هیئت"**: (١) ڕووخسار، شێوە، حاڵ، ڕووخسار و وەزعی هەر شتێك (٢) پۆلێك خەڵك، تاقمێك خەڵك، دەستەیەك خەڵك.

**هیندو "هندو"**: هێندی، خەڵکی هێندوستان، تیرەیەك لە هێندوستان مەزهەبی تایبەتی خۆی هەیە و هێندوستان پێ دەڵێن، کینایەتە بۆ زوڵف و خەت و خاڵی ڕەشی دڵبەر و خۆشەویست.

**هیدایەت "هدایت"**: ڕێ، پیشاندان، ئاراستەی ڕێی ڕاستکردن.

**هودهود**: شانەبەسەر، پەپووسلێمانە، پەپوو سلێمانە، پەپووسڵمانکە، باڵندەیەکە ڕەنگی خۆڵەمێشییە، خاڵی زەرد و ڕەش و سپی هەیە، لە کۆتر بچووکترە، پەپوویەکی وەکو تانج لەسەر سەریدا هەیە، دەڵێن چاوی گەلێك تیژ و وردبینە، لە خۆش خەبەریدا بێ وێنە بووە.

**هودا "هدی"**: خودا، ڕاستی، ڕێی ڕاست، ڕابەر، ڕێ پێشاندەر.

**هووەیدا "هویدا"**: ئاشکرا، دیار، ڕووناك، پەیدا.

## ی

**یەعقوب "یعقوب"**: کوڕی ئیسحاقە، بەناوبانگترین و گەورەترین پیاو ماقوڵانی عیبرانییە، لەقەبی ئیسرائیلە، بەنی ئیسرائیلی بردە میسر و ماوەیەك لەوێ ژیانی بردە سەر، دوازدە کوڕی هەبوو بەناوبانگترینیان حەزرەتی یوسف بوو، دوازدە تیرەکانی بەنی ئیسرائیل بە ناوی ئەوانەوەیە، لە قورئاندا باسی کراوە.

**یوسف**: سەدەی سێزدەی پێش زایین، کوڕی یەعقوب و ناوی دایکی راحیلە، ڕەمزی جوانییە لەناو پیاواندا بە پێی تەورات براکانی فرۆشتیان بە هەندێك لە بازرگانان، لە پاشان بوو بە وەزیری فیرعەونی میسر و بەڕێوەبەری ئازووقە لە برسییەتیەکەدا، بە پێی

قورئانیش براکانی خستیانە بیرێکەوە بەهۆی هەندێك کاروانچی ڕزگـاری بـوو، بردیانـە میسر و فرۆشتیان بە "پوتیڤار" واتە عەزیزی میسر، زولـەیخای ژنـی عـەزیز گـیرۆدە و سـەودا سـەری یوسف بوو، بەڵام یوسف دەسـتی لەگـەڵ تێکـەڵ نـەکرد. لەبـەر ئـەوە لای مێردی بوختانی پێ کرد و خرایە زیندانەوە، لە ئەنجامدا لە زیندان هاتە دەرێ و بوو بـە وەزیری فیرعەون و یارمەتی یەعقوب و بەنی ئیسرائیلی دا کە سینا بکەن بە مەڵبەندی ژیانی خۆیان.

**یەدی** بەیزا "ید بیضـاء": دەستی سپی، ئیشارەتە بەوە کە حەزرەتی موسـا پێغەمبـەر کە دەسـتی دەکرد بە باخەڵیا و دەری دەهێنا تروسـکە و شـەوقی ئەدایـەوە و دەوروبـەری خۆش هەموو ڕووناك دەکرد و حەزرەتی عیسا کە فوی لە مردوو دەکرد زیندوو دەبووەوە.

**یەنبوع** "ینبوع": سەرچاوە، کانیی.

**ئەوەی شایانی باس بـێ بـۆ فەرهـەنگی ئـەو دیوانـە لـە فەرهـەنگی عەمیـد و فەرهەنگی موعین و بە تایبەت لە فەرهەنگی دیوانە "نالی" یەکەی مامۆسـتای زانـا دوکتۆر" مەعروف خەزنەدار" سوودم وەرگرتووە.**